# ئیمام شافیعی

## مەزنترین فەقیهی ئیسلام






حبيب محمد سعيد

# ئیمام شافیعیی

## مەزنترین فەقیهی ئیسلام

حبيب محمد سعيد

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب : ئیمام شـافیعیی
نـووسەر : حبیب محمد سعید
چـاپــی : یەکەم
ساڵی چاپ : ١٤٢٢ ک ـ ٢٠٠١ ز

ژمارەی سپاردن ، ٢٧٧ ، ی ٢٠٠١ ز

# پێشەکیی

**الحمد لله رب العالمين و الصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .**

لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و کرایە خەڵاتی محمد المصطفی ﷺ ، کە نەخشەیەکی تێر و تەواوی خوایی بوو بۆ گرۆی ئادەمیزاد تا ئاخرزەمان.

ئەم نەخشە رەنگینەی پەروەردگار هەموو ئەو ئەحکامانەی تێدا بوون کە خوای گەورە بۆ رێک وپێک‌کردنی ژیانی مرۆڤ ناردبوونی ، تا دین و گیان و عەقڵ و وەچە و سامانی شوێنکەوتوانی دینی خوا پارێزراو بێ .

سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ کە بریتی‌یە لە فەرمایشت و کردار و بڕیارەکانی ، بووە روونکەرەوەی قورئان تا موسڵمانان بە جوانیی لێی تێبگەن . سەرەڕای ئەوەی کە هاوەڵان - خوا لێیان رازیی بێ - عەرەب بوون و، قورئان بە زمانی ئەوان هاتبووە خوارەوە و، بە چاکیی لێی تێ دەگەیشتن و ، زیاد لەوەش کە پێغەمبەری خوایان ﷺ لە ناودا بوو پرسیاریان لێ دەکرد ، یان خۆی هەندێ شتی بۆ روون دەکردنەوە و ، بۆ ئەنجامدانی هەندێ شتیش هەڵی دەنان و ، لە ئەنجامدانی هەندێکی تریش دوورەپەرێزیی دەکردن ..

هاوەڵانیش - خوا لێیان رازیی بێ - هی وایان هەبوو توانای وەرگرتنی زانستی زیاتر بوو و ، هی واشیان هەبوو زوو بە زوو موسڵمان بوو و ، هی واشیان هەبوو بە هیچ شێوەیەک لە کۆڕی پێغەمبەر ﷺ دوور نەدەکەوتەوە . لەبەر ئەوە هەندێ لە هاوەڵان ریوایەتی فەرموودەیان زیاتر دەکرد و هەندێکیش کەمتر .. کاتێکیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەروەردگاری گەیشتەوە ، زانستی قورئان و فەرموودە لە سنگی هاوەڵاندا بوو ، بەڵام هەریەکەیان بە پێی توانای لەبەرکردن و زیرەکیی خۆی .

کە سوپای رزگاریخوازی ئیسلام لە دوورگە دەرچوو و بۆ رزگاریی گەلان بەرەو ولاتان کەوتە رێ و ، ولاتان رزگار کران ، هاوەڵە شارەزاکان یان ئەوە بوو سەربازی سوپای رزگاریی بوون ، یان لە شارە گەورەکانی ئەو ولاتانەدا نیشتەجێ دەبوون تا خەڵکەکە لە ئیسلام شارەزا بکەن ..

بەمە هەندێکێ نیشتەجێی شام و ، هەندێکێ عیراق و ، هەندێکیش میصر بوون .. بـەڵام زۆربەی زۆریان مـەدینـەیان کردە مەڵبەندێکی گشتیی و تیایا مانەوە .

دیارە کە هاوەڵان دەگەیشتنە هەر وڵاتێکێ دەبوونە سەرچاوەی زانسـت و ، فـەتوا لـەوان داوا دەکرا و، بەرەبەرە مرۆڤە زیرەکێ و دڵسۆز و خواناسەکانیان لێ کۆبوونـەوە و مەردانـە بوونە قوتابیی قورئان و چینی تابیعین پێگەیشت .

کە سەردەمی تابیعینیش هاتە بەرەوە ، زاناکانیان زانست و فیقهی قورئـان و سـوننەت و ، ئیجتیهاد و فەتوای هاوەڵانیان وەرگرت و ، بـە پێـی سـەردەمی خۆشـیان را و حوکمـی خۆیان خستە سەری . دوای ئەوانیش تابیعی تابیعین هاتن و ئـەوانیش زانسـت و ئیجتیـهاد و دەلیلی پێش خۆیان وەرگرت و ، بە پێی پێویستیی رۆژگاری خۆشیان ئیجتیهادی خۆیان کرد ..

بەمە موسڵمانان بوونە خاوەنی زانستێکی زۆر ، تا موسڵمانان لە سایەیدا هـەموو گـیر و گرفتێکیان چارەسەر بکەن ، دوای ئەوەی بووبوونـە خـاوەنی کۆمـەڵگایـەکی پێشـکەوتوو، کە ئەو رۆژە سەرزەویی کۆمـەڵی وەها خوێندەوار و چاوکراوە و پێشکەوتووی تێـدا نـەبوو .. ئەو رۆژە سەرانسەری زەویی لە تاریکیی و زوڵم و دواکەتندا دەگەوزایەوە..

جـا هـەندێ لـە زانایـان دەقـەکانی قورئـان و سـوننەتیان بـۆ بڕیـاری کارویـاری رۆژانـــە بەکاردەهێنا و ، هەندێکیش لەو دەقانە حوکمیان دەردەهێنـا و، ئەگـەر دەقیشـیان دەسـت نەکەوتایە رایان بۆ فەتوادان بەکاردەهێنا و ئیجتیهادیان دەکرد .

بە بۆنەی ئەم بۆچوونە جیاوازەوە دوو قوتابخانـە دروسـت بـوون : یەکـەم : قوتابخانـەی فەرموودە لە حیجاز . دووهەم : قوتابخانەی را ( رأي ) لە عیراق .

بەڵام شافیعیی ـ خوا لێی رازیی بێ ـ دەوری تایبەتیی خۆی بووە ، چونکە خوای گـەورە زیرەکیـی کـەم وێنـە و ، لێهـاتنی زۆر و ، راسـتیی و پـاکیی و ئیخـلاص و تـەقوای پێبەخشیی بوو ، تا لە ماوەیەکی کەمی تەمەنیدا زانستی ئەو رۆژە هەمووی کۆ بکاتەوە .

یەکەم جار لە مەککە زانستی لە سوفیانی کوڕی عویەینە و ، موسلیمی کوڕی خالیدی زنجیی و ، سەعیدی کوڕی سالمی قەدداح و ، داوودی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی عەططار و ، عـەبدولمـەجیدی کـوڕی عەبدولعـەزیزی کـوڕی ئـەبورەواد وەرگـرت . پاشـان خـۆی گـەیاندە مەدینە تا زانست لە خزمەتی ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس و ، ئیـبراهیمی کـوڕی سـەعدی ئەنصاریی و ، عەبدولعەزیزی کوڕی موحەممەدی دەراوەردیـی و ، ئیبراهیمی کـوڕی ئـەبو یەحیای ئەسلەمیی و ، موحەممەدی کوڕی سـەعیدی کـوڕی ئـەبوفودەیکێ و ، عـەبدوڵڵای کوڕی نافیعی صائغ دا وەربگرێت .. دوای ئـەوەش خـۆی گـەیاندە یەمـەن و لـە موطریفـی

کوڕی مازین و ، هیشامی کوڕی یووسفی قازیی صەنعاء و ، عومەری کوڕی ئەبوسەلمەی هاوەڵی ئەوزاعیی و ، یەحیای کوڕی حەسسانی هاوەڵی لەیثی کوڕی سەعدیش زانستی وەرگرت .. هەروەها لە وەکیعی کوڕی جەڕڕاح و ، ئەبوئوسامە حەممادی کوڕی ئوسامە و ، ئیسماعیلی کوڕی عولیە و ، عەبدولوەهابی کوڕی عەبدولمەجید زانستی وەرگرت ، هەروەها زانستی ئەهلی ( رأي ) لە موحەممەدی کوڕی حەسەن بە بیستن لێی وەرگرت و ، لە کتێبەکانیشی باری وشترێکی نووسینەوە ..[1]

بەم شێوەیە ئیمام شافیعیی توانیی زانستی زۆربەی مەزهەبەکانی سەردەمی خۆی وەربگرێت ، کە کەسی تر توانای نەبووە ئەو هەمووە زانستە لە شار و ولاتە جۆرا و جۆرەکاندا کۆ بکاتەوە ، سەرەڕای لەبەرکردنی کۆمەڵێکی زۆر لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ، بە رادەیەک کە وتراوە : « ليس هناك حديث في الأحكام لم يضمّنه الشافعي كتبه ».

دوای وەرگرتنی ئەو هەمووە زانیاریییە شەرعی‌یە دەستی بەکار کرد : عەقڵی فراوان و ، چاوساغیی و دوورەبینیی و ، ئیخلاص و دڵسۆزیی و ، زانینی عەرەبی‌یەک کە هیچ کەس شان لە شانی نەدا ، ئەمانەی هەموو خستنە کار بۆ ئیجتیهاد .. بۆ دەست خستنی دەلیلی شەرعیی.. تا ئەوە بوو نەخشەیەکی ژیرانەی، بە پشت‌گیریی بەهێزترین بەڵگەی شەرعیی، بۆ مەزهەبەکەی دارێژا ..

بەمە شافیعیی ، جیاواز لە هەموو موجتەهیدانی تر کاری دەکرد .. یەکەم جار بناغەی دادەڕێژا و پاشان بە دەلیل و بەڵگەی ڕێک و پێک بۆچوونەکانی دادەمەزراند ، تا ئەوەبوو مەزهەبی شافیعیی بووە قوتابخانەی سێهەم لە نێوان قوتابخانەی ( رأي ) و قوتابخانەی ( حديث ) دا .

شافیعیی یەکەم جار بایەخی بە قورئانی پیرۆز دەدا .. هەوڵی دا بە جوانیی لێی تێبگا و ، بە فەرموودەی صەحیحیش ئایەتەکانی روون بکاتەوە .. بەمە هەنگاوێکی گەورەی نا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی فراوان کەڵک لە فەرموودە وەربگرێ بۆ دەرهێنانی حوکمە شەرعی‌یەکان ..

---

[1] الامام الشافعي ، فقيه السنة الأكبر ص ١٠-١١ / عبدالغني الدقر .

جا لەبەر ئەوەی کۆمەڵگای کوردەوارییمان بە درێژایی مێـژووی ئیسـلام پابـەندی مەزهەبی ئیمام شافیعیی بووە و ، زانا بەڕێزەکانیش لەو قوتابخانە ئازیزە زانسـتیان وەرگرتووە ، وامان بە چاک زانیی شتێک لە ژیانی مامۆستای پایەبەرز و مەزنترین فەقیهی ئەهلی سوننەت بخەینە بەردەست گەلی کـوردی موسـڵمان ، بـەو هیوایـەی جێی ڕەزامەندیی خوای گەورە بێت و، موسڵمانانیش کەڵکی لێ وەربگرن .. سا خـوا کۆمەک بێت ..

سلێمانیی
١٤٢٢/١/١٦ ک
٢٠٠١/٤/١٠ ز

# پێگەیشتنی شافیعیی

یەکەم صەدەی حوکمی دەوڵەتی عەبباسیی ، لە بارەی شارستانێتیی و ڕۆشنبیریی و فیکر و زانستەوە بە چەرخی زێڕین و گەشاوەی ئیسلام دادەنرێت ، چونکە خەلیفە بەوپەری رێک و پێکییەوە دەستی بەسەر کاروباری وڵاتدا گرتبوو و ، پێویستیی موسڵمانان لەو وڵاتە پان و بەرینەدا بە هۆیەکانی گواستنەوەی ئەو سەردەمەوە جێبەجێ دەکران .. موسڵمانان زۆر حەساوە و چاوکراوە و دڵ ئاسوودە و بێخەم بوون .. خۆیان سەرداری سەرزەویی بوون ..

خەلیفە یانێ یەکەم دەست ڕۆیشتووی سەرزەویی ..

کۆمەڵگای ئیسلامیی یانێ کۆمەڵی پێشکەوتوو و خاوەن مافی سەرزەویی ..

قورئان و سوننەت یانێ نرخ و بەها دیاریی‌کردن بۆ مرۆڤ .. هیچ کافرێک لە رووی نەدەهات لە ئاستی خۆردا چاو هەڵ بێنێ ، چ جای گاڵتە بە ئیسلام و موسڵمانان بکات .. ئەو رۆژە پیاو پاسەوانی شەریعەت و دەوڵەتی شەریعەت بوون .. ئەو پیاوانە سەنگی مێشوولەیان بۆ کافران و مونافیقان دانەدەنا .. هەتا زانا بەرزە پایەدارەکان بوونیان بۆ خەلیفەش لە قەڵەم نەدەدا و ، خۆیان لە دام و دەزگای بە دوور دەگرت ، تا زیو و زێڕی دەوڵەت کار نەکەنە سەر دڵیان و ، ئەو پرۆگرامە قیامەتی‌یەی کە بۆ خۆیان و شاگردانیان نەخشە کێشاوە لەکەدار نەبێت و ، کۆمەڵی موسڵمان هەردەم چاوی لە ئالای شەکاوەی قوتابخانەی شەریعەت بێت ، کە دەستە دەستە و پۆل پۆل زانا خواناسە رەببانی‌یەکان تیایا دەردەچن و ، ئەرک و فەرمانبەریی سەرشانی خواپەرستان دەگرنە ئەستۆ و ، هەریەکە لە قوژبنێکەوە خەریکی گەیاندنی بانگی تەوحید دەبێت ، تا بە تیشکی زێڕینی ئیسلامی بێگەرد تاریکیی کوفر و ئیلحاد بڕەوێتەوە و ، ئەو دێوە زمەیە لەسەر شان و ملی ئادەمیزادی بێچارە بخرێتە خوارەوە ..

ئا لەم چەرخە رووناکە گەشاوە دڵڕفێنە پڕ بەختەوەریی‌یەدا ئیمامی شافیعیی هاتە دنیاوە و ، بۆ خزمەتی ئیسلام دەستی بەکار کرد ، تا یەکێ لە موعجیزەکانی ئازیزی

نەبێزراومان حەزرەتی محمد المصطفى ﷺ بێتـە دیـی ، کـە ئاماژە بـۆ ئیمام شـافیعیی دەکات کە زانایەکی قورەیش سەرزەویی پڕ لە زانسـت دەکـات ، کـە دەفـەرموێ : ( عــالم قریش یـــملأ طباق الأرض علماً ) . [٢]

لە ڕۆژی ( حروراء )یـشدا ، کـاتێک کـە ئیمـام عـەلیی ویـستی عـەبدوڵلای کـوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازیی بێ - بنێرێ بۆ لای خەواریج ئەم فەرموودەیــەی بـۆ گێڕایـەوە کە دەفەرموێ : « لا تؤموا قريشاً ، وائتموا بها ، ولا تَقَدموا على قريش وقدِّموهـــا ، ولا تعلموا قريشاً ، وتعلموا منها ، فإن إمامة الأمين من قريش تعدل إمامة الأمين من غـيرهم وإن علم عالم قريش ليسع طباق الأرض » .

جا ئیمام عـەلیی بە عـەبدوڵلای فەرموو : پێیان بڵێ : لە سـەرچیی تـاوانبـارم دەکـەن ؟ شاهێدیی دەدەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە . [٣]

جا لە بارەی ئەو فەرمایشتەی ئازیزەوە : « عالم قريش يملأ الأرض علمـــاً » ئیمـامی پایەبەرز ( ابو نُعيم عبدالملك بن محمد الفقيــــه ) دەری بڕیـوە کـە زانایـەکی قورەیشـیی سەرزەویی لە زانست پڕدەکات و ، کتێبــی زۆری دەبـن و ، موسـڵمانان بـە پـیرو گەنجـەوە تەدریسیان دەکەن و ، دەیانکەنە چاوساغی خۆیان و لە فەتوا شــەرعیيەکاندا پشتیان پـێ دەبەستن .

جا مامۆستا ( عبدالملك ) دەری دەبڕێ کە ئەم ناونیشــانانە تەنـها شـافیعیی دەگرنـەوە و تەنها زانستی ئەم و کاریگەریی زانستی ئەمە کە ئەو فەرموودەیەی پێ تەئویل بکرێت . [٤]

ئیمام شافیعیی : ئەبو عەبدوڵلا ، موحەممەدی کوڕی ئیدریسـی ، کـوڕی عـەبباسـی کوڕی عوثمانی ، کوڕی شافیعیی ، کوڕی سائیبی ، کوڕی عوبەیدی ، کـوڕی عـەبدیـەزیدی، کوڕی هاشمی ، کوڕی موطەللیبی ، کوڕی عـەبدمـەنافە کە باپیری باپـیری پێغەمبـەرە ﷺ. واتە لە عـەبدمـەنافدا یەک دەگرن .

ئیدریسی باوکی شافیعیی لە مێژوودا شتێکی ئەوتۆی لەسەر نەنووسراوە ئـەوەندە نـەبێ کە لە مەدینەدا ژیاوە و ، دواییش بۆ عـەسقەلان ، کە دەکەوێتە وڵاتی فەلەسـتین ، کۆچـی کردووە و هەتا مردنی لەوێ ماوەتەوە .

---

[٢] سەیری تەخریجی ئەم فەرموودەیە بکە لە ( كليات رسائل النور / ٢ / المكتوبات ص ١٣٧ ، ١٤٤ ) دا .

[٣] الطبقات الكبرى للسبكي ( ١ : ١٩٨ ) .

[٤] الإمام الشافعي ، فقيه السنة الأكبر / عبدالغني الدقر ص ٤٠ ـــ ٤١ .

عەبباسی کوڕی عوثمانی باپیریشی لە مێژوودا زۆر باس نەکراوە ئەوەندە نەبێ کە فەرموودەی ریوایەت کردووە و لێشی‌یەوە ریوایەت کراوە .

عوثمانی کوڕی شافیعی باوکی باپیریشی تا سەردەمی خەلافەتی ئەبولعەبباسی سەففاح ژیاوە و ، شافیعی کوڕی سائیبی باپیری باپیریشی کە بە بۆنەی ئەوەوە نازناوی ( شافیعیی ) لێ نراوە ، هاوەڵی پێغەمبەر بووە و لە فەرموودەیەکیشدا کە حاکم تەخریجی کردووە و ئەنەس ریوایەتی کردووە باسی هاتووە . ئەڵێت : رۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لە ژێر چادرێکدا دەبێت و سائیبی کوڕی عوبەیدیش دێتە خزمەتی و کوڕەکەشی ، واتە شافیعی کوڕی سائیب ، لەگەڵیا دەبێت . ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ سەیرێکی کوڕەکەی کرد و فەرمووی : ( من سعادة المرء أن يشبه أباه ) [٥] فەرمووی : خۆشبەختی‌یە کەسێک لە باوکی خۆی بچێت ..

سائیبیش ، واتە باوکی شافیع ، لە کاتی جەنگی بەدردا موشریک بووە و لەناو سوپای قوڕەیشدا هەڵگری ئاڵای نەوەی هاشیم بووە و سەرەنجام دیل دەکرێت و بە فیدیە خۆی رزگار دەکات . پاشان موسڵمان دەبێت . لێی دەپرسن : بەر لەوەی فیدیە بدەیت بۆچ موسڵمان نەبوویت ؟ ئەڵێت : نەمویست موسڵمانان لەو فیدیەیە بێبەش بکەم کە بە تەمای بوون .

کاتێکیش کە لەگەڵ عەبباسی کوڕی عەبدولموطەللیبدا بە دیلیی دەیانهێننە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەری دەبڕێ کە لەگەڵ سائیبدا برای یەکترین کە دەفەرموێ : ( هذا أخي وأنا أخوه ) . [٦]

وتراویشە کە : سائیب لە شێوەدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە . جارێکیان نەخۆش دەبێت ، عومەر ئەفەرموێ : هەستن با بچین عەیادەی سائیبی کوڕی عوبەید بکەین ، چونکە ئەو لە پیاوە پاڵفتەکانی قوڕەیشە .. [٧]

عوبەیدی کوڕی عەبد یەزیدیش لە « الإصابه » دا بە هاوەڵ لە قەڵەم دراوە . هەروەها عەبد یەزیدی کوڕی هاشمیش هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ..

---

[٥] الإصابة ( ٢ : ١١ ) .
[٦] الإصابة ( ٢ : ١١ ) .
[٧] الإصابة ( ٢ : ١١ ) .

هاشمی کوڕی موطەللیبیش برازای هاشمی کوڕی عەبدمەنافـە ، کـە باپیرە گـەورەی پێغەمبەری خوایە . جا لەبەر ئەوەی کە موطــەللیب و هاشم برایـەتی‌یان زۆر خۆش بـووە موطەللیب کوڕەکەی ناو ناوە هاشم .

موطەللیبی کوڕی عەبدمەنافیش مامەی عەبدولموطــەللیبی باپیری پێغەمبـەری خـوا بووە و هەر ئەویش پێی گەیاندووە . چونکە هاشمی کوڕی عەبدمەناف لە شـاری یـەثریب لە هۆزی خەزرەج ژنێـک مـارە دەکات و کوڕێکی لێی دەبێ و ناوی دەنێ ( شـیبةالحمد ) ـ کە عەبدولموطەللیبە ـ لەگەڵ دایکی‌دا سەردانی یەثریب دەکەن و هاشمیش بۆ بازرگـانیی بەرەو شـام دەردەچـێ و لـەوێ لـە شـاری غـەززە کۆچـی دوایـی دەکـات .. دوای ماوەیـەک موطەللیب دەچێت بۆ یەثریب و دەبینێ وا ( شیبة الحمد )ی برازای گەورە بووە . ئیـتر لـە پاشکۆی‌دا هەڵی دەگرێ و دەی‌هێنێتەوە مەککە و کە خەڵکیی لە پاشـکۆی‌دا دەی بینـن وا دەزانن بەندەیە و کریوەتی ، لەبـەر ئـەوە نـاوی دەنێـن عەبدولموطــەللیب . هـەندێکیش ئـەڵێن : لەبـەر ئـەوەی کـە موطــــەللیب شـەیبەی بـرازای بـەخێوکردووە ناویـان نـاوە عەبدولموطەللیب .

بەڵێ عەبدمەناف چوار کوڕی هەبوون : هاشم و موطـەللیب و عـەبدشـەمس و نەوفـەل ، بەڵام هەروەک هاشم و موطەللیــب پـەیوەندی‌یان پتـەو بـوو ، ئـەوا منداڵەکانیشیان هـەروا یەکتریان زۆر خۆش دەویست ، هەتا نەوەی موطەللیب ، بە موسـڵمان و کافریانـەوە ، شـان بـە شـانی نـەوەی هاشـم ، لەوکاتـەدا کـە قورەیـش گـەمارووی ئـابووریی خـستبووە سـەر پێغەمبەر و موسڵمانەکان ، پشت‌گیریی موسڵمانەکانیان کرد . بۆیە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لە کاتی دابەش کردنی ( خمس ) دا نەوەی موطەللیبیشی وەک نەوەی هاشم لـە قەڵـەم دا و لە ( خمس ) بەشی دان . بەڵام نەوەی عەبدشەمس و نەوەی نەوفەل بەشی نەدان هەرچـەندە ئەوانیش وەک نەوەی موطەللیب ئامۆزای نەوەی هاشم بوون .

پێویستە لە یادیشمان بێ کە بەناوبانگ‌ترین هۆزی موضەر کەنانەیـە و ، قورەیشـیش لە کەنانەیە و ، هەرکەسێـک لـە نـەوەی نـەضری کـوڕی کەنانـە بووبێـت بـە قورەیشـی‌یان ژماردووە .

جا لەبەر ئەوەی کـە قورەیـش ئـەهلی حـەرەم و پارێزگـاری مـاڵی خـوا بـوون ، لـەناو عەرەبەکان‌دا پایەدار بوون و ، لە کاتی گەشتی بازرگانیی‌دا کەس نەی‌دەتوانی دەستیان بـۆ بەرێ ، یان رێ‌یان لێ بگرێ . ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەمە دەکات و دەفـەرموێ :

﴿ وقالوا : إن نتبع الهدى معك نتخطف من أرضنا ، أو لم نمكن لهم حرما آمنا يجبى إليه ثمرات كل شيء ، رزقاً من لدنا ، ولكن أكثرهم لا يعلمون ﴾. ( القصص : ٥٧ )

کافرەکان دەیانوت : ئەی موحەممەد ! ئەگەر ئێمە شوێن ئەم ڕێبازی هیدایەتە بکەوین لەگەڵتدا ، ئەوا هەموو خەڵکەکە دەبێتە دوژمنمان و لە شوێن و مـاوای خۆمـاندا دەمـان فڕێنن . خوای گـەورەش وەڵامـی ئـەو نەفامانـە دەداتـەوە : کـە هـەر ئێمـە لـەو حـەرەمی مەککەیـەدا تـەمکینمـان بـەوان نەبەخشـیوە کـە لـە هـەموو لایەکـەوە ڕزقیـان بەسـەردا دەبارێنین ؟ لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان بەو نیعمەتە نازانن .

هەروەها قورئانی پیرۆز لە سوورەتی ( قريش ) دا منەت بەسەر قوڕەیشدا دەکـات کـە ڕزقـی پـاک و بێگـەرد و ئـەمن و ئاسایشـی پێبەخشـیون و تـرس و برسـێتیی لێ دوور خستوونەتەوە .

هەموانیش دەیزانن کە لە ناو هەموو عـەرەبدا قوڕەیشـییەکان بـە عـەقل و ژیریـی و دانایەتیی و دانبەخۆداگرتن ناسرابوون .. چیی ڕەوشـتی بـەرز هـەبوو ئـەوان دەسـتیان پێـوە دەگرت . لەبەر ئەمە بووبوونە سەردار و خەڵک شوێنیان دەکەوت .

ئەوەتا ئیمام بوخاریی فەرموودەیەک لەو بارەوە لە ئەبوهورەیرەوە ـ خوا لێی ڕازیی بـێ ـ ڕیوایەت دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : « الناس تبع لقريش في هذا الشـأن. مسلمهم تبع لمسلمهم ، وكافرهم تبع لكافرهم ... الحديث » .

هەروەها موسلیمیش لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ـ خوا لێـی ڕازیـی بـێ ـ دەگێڕێتـەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : « الناس تبع لقريش في الخير والشـر » . دەفـەرموێ : قوڕەیش چاک بن یان خراپ بن خەڵک شوێن پێیان هەڵ دەگرێت ..

زۆربەی ئەوانەی کە ژیانی ئیمامیان نووسیوە لەسەر ئەوە یـەک دەنگـن کـە دایکـی لـە هۆزی ( ئـەزد ) ە و ، هـەر هەمووشـیان لەسـەر ئـەوە یـەک دەنگـن کـە ئـافرەتێکی زۆر خواناس و ڕەوشت بەرز بووە و ، خاوەنی فیطرەتێکی پاک و خاوێن بووە .[٨]

لە بارەی زیرەکیی دایکی شـافیعییەوە دەگێڕنـەوە کـە لەگـەڵ پیـاوێک و ژنێکـی تـردا دەچنە بەردەم قازیی مەککە بۆ شـاهێدییدان .. لـەو کاتـەدا قـازیی دەیـەوێ ژنـەکان یـەک یەک بانگ بکات بۆ شاهێدیی ، کەچیی دایکی ئیمـام نـاڕازیی دەبـێ و بـە قـازیی ئـەڵێ :

---

[٨] الطبقات الكبرى ( ٢ : ١٧٩ ) .

بۆت نیە ئەو کارە بکەیت ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَىٰ ﴾ ( البقرة : ٢٨٢ ) . بەمە قازیی واز لەو بۆچوونەی خۆی دێنێ .

ئیبن حەجەر ئەم هەڵوێستەی بە لاوە چاک دەبێت ، کە ئەڵێت : « وهذا فرع غريب ، واستنباط قوي » [٩] .

لە رۆژی جومعەی دوا رۆژی مـانگی رەجـەبی سـاڵی صـەد و پـەنجای کۆچیـی‌دا ئیمـام شافیعیی هاتۆتە دنیاوە ، کە ئەو ساڵەیە ئیمـام ئەبوحەنیفـە کۆچـی دوایـی تێـدا کـردووە . بەڵام نووسەران بۆ شوێنی لە دایک بوونی جیاوازی‌یان هەیە . هـەندێ ئـەڵێن لـە غـەززە و هەندێکیش عەسقەلان و هەندێکیش یەمەن و هەندێکیش مینا ، بەڵام ئەوەی راستتـر بـێ ئەوەیە کە لە غەززە لە دایک بووە و دایکی بردوویەتی بۆ عەسقەلان ، وەک یـەکێک لـە قوتابیەکانی ، کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولحەکەمە گێڕاویەتـەوە . [١٠] پاشانیش لە تەمەنی دوو ساڵیی‌دا براوە بۆ مەککە و لەوێ گەورە بووە . [١١]

بەڵام ئیبن حەجەر وەهای بۆ چووە کە لە غـەززەی عەسـقەلان لـە دایـک بـووە و ، لـە تەمەنی دوو ساڵیی‌دا دایکی بردوویەتیەوە بۆ حجاز بۆ ناو خزمەکانی ، بەڵام کە گەیشتۆتە دە ساڵیی لە ترسی ئەوەی کوڕەکەی نەسەبی خۆی لە یاد بکـات یـان بفـەوتێ هێناویەتـەوە مەککە ناو خزمە قوڕەیشی‌یەکانی [١٢] .

کە شافیعیی چاوی کردەوە و فامی پەیدا کرد خـۆی لـە مەککـەدا بینیـی .. مەککـەی شوێنی دابەزینی وەحی و ، مەڵبەندی گەشەکردن و پەرەسەندنی ئیسلام .. ئەو مەککەیەی کە لە هەموو کون وقوژبنێکی سەرزەوی‌یەوە دڵان کەمەندکێش دەکات .. ئەو مەککەیـەی کە خوا بە بۆنەی کەعبەی پیرۆزەوە شەرەفمەندی کردووە ..

لە مەککەدا کە چاوی هەڵ هێنا مزگەوتی حەرامی بینیی کە هەردەم لە قورئانخوێـن و زانای حـەدیث و شـارەزای فیقهـ و خـەمخۆرانـی ئیسـلام و قوتـابیی و گوێگـران پـڕە و ، کەعبەی پیرۆزیش لە ناوەڕاستی‌دا بە درێژایی ساڵ بە شەو و بە رۆژ لـە تـەوافکـەران چۆڵ نابێت ..

---

[٩] توالي التأسيس ( ٤٦ ).
[١٠] توالي التأسيس ( ٤٩ ) .
[١١] شذرات الذهب ( ٢ : ٩ ) .
[١٢] توالي التأسيس ( ٤٩ ) .

لەم شوێنە پیرۆزەدا و لەناو زانایـان و پیاوچاکـانی موسـڵماناندا شـافیعیی چاوی هـەڵ هێنا و ، بە ژیرانە جێی خۆی کردەوە و رووی لە وەرگرتنی زانیاریی نا ..

سەرەتا دایکی ژیـر و بەسـەلیقەی ویستی کورەکـەی بداتـە دەسـت مامۆستایەک تـا خوێندنەوە و نووسینی فێر بکات ، بەڵام بیری کـردەوە ئـەوێکی دەسـتکورت توانـای نیـە مووچەی مامۆستاکەی بدات ، ئیتر کورەکەی چۆن بخوێنێت ؟ مامۆستا کە ئەمەی زانیـی و هەستیشی بە نەجیبیی و زیرەکیی و رەوشت جوانیی شافیعیی کرد ، وازی لە کرێی خـۆی هێنا و بەوەندە رازیی بوو کە هەر کـاتێ خـۆی لـەوێ نـەبێ ئـەم جێـی بگرێتـەوە . بگـرە لەوانەشە مامۆستا هەستی کرد بێ کە بۆ فـێرکردنی شـافیعیی ئـەوەندە مـاندوو نـابێ کـە شایانی کرێ وەرگرتن بـێ . چونکـە تـا مامۆسـتا ئایـەتێکی فـێری منـاڵێک دەکـرد خێرا شافیعیی ـ هەر بە بیسـتنی ـ لەبـەری دەکـرد و ، مامۆسـتا هـەر شتێکیشـی بـۆ قوتابیـان دەخوێندەوە تا بە دوایدا بینووسن ، خێرا شافیعیی هەمووی لەبەر دەکـرد ، تـا رۆژێکیـان مامۆستا پێی ئەڵێ : بۆم حەڵاڵ نیە هیچت لێ وەربگرم .[13] بەم شێوەیە خەریک بوو هەتا ئەوە بوو لە تەمەنی حەوت ساڵییدا هەموو قورئانی لەبەرکرد .[14]

ئەمە سـەرەتای زانسـت وەرگرتنـی شـافیعیی بـووە . دوای ئـەوە دەچێتـە مزگـەوت و ، بەوپەڕی حەز و تاسەمەندییەوە و ، بە مێشکێکی ساف و زیرەکەوە لە خزمـەتی زانایـاندا زانست وەردەگرێت ، بـەڵام ئـەوەندە دەسـتی کـورت دەبێـت نـاتوانێ بـۆ نووسـینەوەی ئـەو زانستەی کە دەیبیست کاغەز بکرێت .. ناچـار دەسـت بـە کۆکردنـەوەی ئێسـقان و دەفـەی شانی وشـتر و پارچـە پێسـتە دەکـات هـەتا فـەرموودەیان لەسـەر بنووسێتەوە ، تـا چـەند کووپەیەکی دایکی لەم شتانە پڕ دەکات ..[15]

ئەوەندە دەستکورت دەبێ خزمێکیان ئامۆژگاریی دەکات تـا واز لـە خوێنـدن بـهێنێ و دەست بداتە کاسپیی کردن ، کەچیی ئیمام دڵی نایەت دەست لە زانسـت هـەڵ بگـرێ ، تـا خوای گەورە لە بەخششی خۆی رزقی بۆ ئەنێرێ .[16]

---

[13] معجم الأدباء ( ١٧ : ٢٨٤ ) .
[14] شذرات الذهب ( ٢ : ٩ ) .
[15] معجم الأدباء ( ١٧ : ٢٨٤ ) آداب الشافعي ومناقبه ( ٢٥ ) .
[16] توالي التأسيس ( ٥٠ ) .

تـا بڕینـی ئەم قوناغەش هێشتا شافیعیی باڵغ نەبوو بوو . هەر لەم قوناغـەدا کتێبـی ( الموطأ ) ی ئیمام مالیكْ ی لەبەر کرد ، کە هێشتا نەچووبووە خزمەتی ئیمام مالیكْ بـۆ خوێندن .

موزەنیی لە ئیمام شافیعییەوە ریوایـەتیکردووە کـە فەرموویـە : « لەحـەوت سـاڵییدا قورئانم لەبەر کردووە و ، لە دە ساڵییشدا ( الموطأ ) » .[17]

هەر بەو منداڵییە حەزی لەوە بوو بە چـاکیی لـە زمـانی عـەرەبیی شـارەزا ببـێ ، بـۆ ئەمە سەری لە دەشت و بیابان دەدا بۆ فێربوونی نـەحوو ئـەدەب و خـەریکی لەبـەرکردنی شیعر دەبوو .. جارێکیان تووشی موسلیم ی کـوڕی خـالیدی زنجیـی[18] دەبێـت و پرسـیاری لێ دەکـات : ڕۆڵـە ! خـەڵکی کوێیـت ؟ ئـەڵێت : خـەڵکی مەککـەم . دەپرسـێ : ماڵتـان لەکوێدایە ؟ ئەڵێت : لە شیوی ( خەیف ) . دەپرسێ : لە چ هۆزێکی ؟ ئەڵێت : لە نـەوەی عەبدمەنافم . ئەڵێت : بەخ ، بەخ !!

خوای گەورە شەرەفمـەندی دنیـا و قیامـەتی کردوویـت ، خۆزگـە ئـەم زیرەکیـی و تـێ گەیشتنەت بۆ ئەم فیقهە بەکار بهێنایە ، ئەو کاتە بۆت چاکتر دەبوو .[19]

هەروەها کەسانی تریش ئامۆژگاریی دەکەن هەتا واز لە شیعر بهێنێ و ڕوو لـە فیقهـ و زانستی قورئان بکات . کە دێتەوە مـەککـە دەچێتـە خزمـەتی سـوفیانی کـوڕی عویەینـە و چەندێ خوا ویستی لەسەر بێ زانستی لێ وەردەگرێ .. هەروەها دەچێتە خزمەتی موسـلیم ی کوڕی خـالیدی زنجیـی و لـەویش زانسـت وەردەگرێ ، پاشـانیش دەچێتـە مەینـە و لـە خزمـەتی ئیمام مـالیكدا دەمێنێتەوە .[20]

لـە ڕاسـتییدا شـافیعیی فـێربوونی عـەرەبیی و شـارەزابوون لـە شـیعری بـۆ خزمـەت شەریعەت دەویست ، بۆیـە کـە ڕوو لـە فیقهـ دەکـات ، دەسـت بـەرداری شارەزابوون لـە عەرەبیی نابێ ، تـا سـەرەنجام دەبێتـە مامۆسـتای مامۆسـتایان و ئیمامـە شـارەزاکانیش

---

[17] توالي التأسيس ( ٥٠ ) .

[18] موسلیم ی کوڕی خـالیدی زنجیـی : مامۆسـتا و موفتیـی حـەرەمی مـەککیی و فەقیـهی مەککـە بـووە . پیـاوێکی خواناس بووە و لە ساڵی ١٨٠ ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە .

[19] المجموع ( ١ : ١٥ ) .

[20] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٠ ) المجموع ( ١ : ١٥ ) .

شانازیی پێوە دەکەن .. بە رادەیـەکی کـە ئەگـەر سـوفیانی کـوڕی عویەینـەی مامۆسـتای[21] تەفسیری قورئان یان فەتوای داوا لێ بکرایە ، ئاوڕی ئەدایەوە بۆ لای شافیعیی و دەیوت: پرسیار لەو منداڵە بکەن .[22]

هەروەها موسلیم ی کـوڕی خـالیدی زنجیـی مامۆستا و موفتیـی مەککـە کـە یەکـەم مامۆستای شافیعیی بووە کە تەمەنی شافیعیی دەگاتە ( ۱۵ ) ساڵیی پێی ئەڵێ :

« ئەبو عـەبدوڵڵا ! فەتوا بدە . بەخوا کاتی ئەوەت هاتووە کە فەتوا بدەیت » .[23]

لەم قۆناغـەدا شافیعیی ئەو فەرموودانەی کە بەلای سوفیانی کوڕی عویەینـەی شـارەزای فـەرموودەی حـەرەمی مەککیـیەوە بـوون نووسـینەوە و ، فیقهیشـی لـە موفتیـی مەککـە موسلیم ی کوڕی خالیدی زنجییەوە وەرگرت و ، فەرموودەشی لە سەعیدی کوڕی سـالمی قـەدداح و ، داوودی کـوڕی عـەبدوڕڕەحمانی عـەططار و ، عەبدولمـەجیدی کـوڕی عەبدولعەزیزی ئەزدییەوە گێڕاوەتەوە .

بیشری مـوریسیی وتوویە : لە مەککەدا گەنجێکم دیوە ئەگەر بمێنـێ دەبێتـە پیـاوی ( ناوداری ) دنیا . کاتێکیش بیشر ـ کە موعتەزیلە دەبێت ـ حـەجی مـاڵی خـوا دەکـات و دەگەڕێتەوە ، هاوەڵانی پرسیاری ئەوەی لێ دەکەن کە لە مەککەدا چاوی بە کێ کـەوتووە : ئەڵێت : پیاوێکم دیوە کە ئەگەر لەگەڵتاندا بێت هەرگیز نابەزرێن و ، ئەگـەر لـە دژیشـتان بێت وریا بن و خۆتان ئامادەی بکەن ، ئەویش موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعییە .[24]

لەم قۆناغـەدا لە مزگەوتی کەعبەدا وانەی بە خەڵک وتووە . حەرمەلە ئەڵێت : چاوم لێ بووە شافیعیی لە مزگەوتی حەرامدا خەڵکیی فێر دەکرد و تەمەنیشی سیانزە ساڵان بوو .[25]

ئێستـەش بـا سـەرنجێکی ئیمـام شـافیعیی بگریـن بزانـین لـەم قۆناغـەدا چ چالاکییـەکی لاوانەی لێهاتووە ..

---

[21] سوفیانی کوڕی عویەینە : مامۆستای حـەدیث بـووە لـە حـەرەمی مـەککییدا . لـە شـاری کووفـە لـە دایـک بـووە و نیشتەجێی مەککە بووە و ، هەر لەوێ لە ساڵی ۱۹۸ ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە . خاوەنی زانسـتێکی یـەکجار زۆر بووە . لەو بارەوە ئیمام شافیعیی ئەفەرموێ : ئەگەر مالیک و سوفیان نەبوونایە زانستی حیجاز تیادەچوو.

[22] وفيات الأعيان ( ۱ : ٥٦٦ ) .

[23] وفيات الأعيان ( ۱ : ٥٦٦ ) .

[24] تذهيب الأسماء واللغات ( ۱ : ٦٣ ) .

[25] تهذيب الأسماء واللغات . حەرمەلە : کوڕی یەحیای کوڕی عەبدوڵڵای تەجیبییـە . ئیمـامێکی پایـەدار بـووە . یـەکێ بووە لە هاوەڵانی شافیعیی و فەرموودەی لەویش و لە کەسانی تریشـەوە ریوایـەت کـردووە . سـاڵی ( ۲۳٤ ) ی کۆچیـی کۆچی دوایی کردووە ..

کاتێک که بۆ فێربوونی زمانی عەرەبیی بۆ بیابان دەردەچوو ، هەندێ هونەری تریش فێر بوو ، وەک تیراندازیی . ئەوەندە شارەزایی تێدا پەیدا کرد که لە دە تیردا دە یان نۆیان نیشانەکەیان دەپێکا . هەروەها شارەزای زانستی پزیشکییش بووە .[٢٦] شان بە شانی ئەمەش شافیعیی خۆی فێری سوارچاکیی کردووە و سوارچاکێکیشی لێ دەرچووە کە هاوتای نەبێت . رەبیع وتوویە : شافیعیی . لە هەموو کەسێک ئازاتر و سوارچاک تر بووە ، بە رادەیەک که ئەگەر ئەسپەکەی لە غاردا بوایە گوێی دەگرت و خۆی هەڵ ئەدایە سەری . ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هەموو ئەندامێکی ئوممەتی ئیسلام ، بە تایبەت زانایان و پێشەوایانی ، خۆی بۆ جیهاد ئامادە دەکرد .. هەر هەموو پاڵەوانی مەیدان بوون بۆ لووت شکاندنی هەر کافرێک کە بیەوێ پێ بخاتە خاکی ئیسلامەوە ..

هەروەها ئیمام شافیعیی دەنگی زۆر خۆش بووە ، بە رادەیەک کە خەڵکیی دەهێنایە گریان . بەحری کوڕی ئەصر وتوویە : کاتێک بمانویستایە بگرین بە یەکترییمان دەوت : هەستن بابچین بۆ لای ئەو لاوە موطەللیبیيە تا قورئانمان بۆ بخوێنێ . کە ئەهاتینە لای دەستی بە خوێندنی قورئان دەکرد ، تا ئەوە بوو لەبەر خۆشیی دەنگی هەندێک بێهۆش دەکەوتن و خەڵکەکە دەنگی گریانیان بەرز دەبوویەوە . کە حاڵی خەڵکەکەی دەدیی ئەویش لە قورئان خوێندن دەستی هەڵ دەگرت .[٢٧]

ئیمام ئەحمەدیش باسی دەنگخۆشیی ئیمام شافیعیی کردووە کە لە کاتی قسەکردندا دەنگی وەک دەنگی زەنگ زرنگاوەتەوە .

ئیمام شافیعیی وەک خواناسێکی رەببانیی جل و بەرگی سادەی لەبەرکردووە و پێڵاوی سادەشی لە پێ کردووە . ئەمووستیلەیەکی لە پەنجە کردووە کە لێی نووسراوە : « **كفى بالله ثقة لمحمد بن إدريس** » .

لەوە دەچێ ئیمام شافیعیی دوای گەڕانەوەی لە مەدینە ژنی هێنابێ و ، تەنها یەک ژنیشی هێناوە کە ناوی حەمدەی کچی نافیع ی کوڕی عەنبەسەی کوڕی عەمری کوڕی عوثمانی کوڕی عەففان بووە .

شافیعیی تەنها دوو کوڕی بوون و لەبەر خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیانی ناو ناون موحەممەد هەرچەندە خۆشیی ناوی موحەممەد بووە .

کوڕە گەورەکەی کە موحەممەد ئەبو عوثمان بووە ، فەرموودەی لە باوکی و ، لە سوفیانی کوڕی عویەینە و ، عەبدوڕڕەزاق و ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەرگرتووە و ،

---

[٢٦] توالي التأسيس ( ٦٧ ) ، تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٥ ) .
[٢٧] الوافي بالوفيات ( ٢ : ١٧٣ ) .

ماوەیەکیش بۆتە قازیی ناوچەی جەزیرە و لەوێ فەرموودەی بلاوکردۆتەوە و زانایانی جەزیرەش ریوایەتیان لێوە کردووە . هەروەها لە حەلەبیش بۆتە قازیی و سالانێکی زۆر لەوێ ماوەتەوە .

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەم کوڕەی ئیمام شافیعیی فەرمووە : لەبەر سێ شت خۆشم ئەوێیت : کوڕی ئەبوعەبدوللاّ ، واتە شافیعییت ، پیاوێکی قورەیشییت ، پیاوێکی هەلگری سوننەتیت . ئەم کوڕەی ئیمام لەگەلّ ئیمام ئەحمەددا لەسەر خۆشەکردنی پێستەی مردارەوە بوو وت و وێژی هەیە .

ئەم کوڕەی بووە کە باوکی لۆمە و ئامۆژگاریی کردووە کە فەرموویە : « کوڕەکەم ! بە خوا ئەگەر بزانم ئاوی سارد پیاوەتییم ئەڕووشێنێ بە گەرمیی نەبێ نایخۆمەوە »[28] .

کوڕی دووهەمیشی موحەممەد ئەبولحەسەن بووە کە دایکی کەنیزەک بووە و ، کاربەدەستیی قنسرین و عەواصیم ی کردووە . هەر بە منداڵیی لەگەلّ باوکیدا هاتۆتە میصر و هەر لەوێش لە مانگی شەعبانی ساڵی دووصەد و سیی و یەکدا کۆچی دوایی کردووە[29] .

هەروەها تاقە کچێکیشی بووە کە ناوی زەینەب بووە ، کە شووی بە ئامۆزایەکی شافیعیی خۆی کردووە و کوڕێکی لێی بووە بە ناوی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوللاّ و بە کچەزای شافیعیی ناسراوە . نەوەویی ئەلێت : ئیمامێکی دیار بووە کە لە خاوخێزانی شافیعییدا دوای شافیعیی خۆی کەسێک وێنەی ئەو نەبووە .. بەرەکەتی باپیری بۆ ئەو گەڕابوویەوە ..[30]

---

[28] الطبقات الكبرى ( ٢ : ٧١ ـ ٧٢ ) .

[29] الطبقات الكبرى ( ٢ : ٧٣ ) .

[30] الطبقات الكبرى ( ٢ : ١٨٦ ) .



# بەرەو مەدینەی مونەووەرە

ئەوەی شافیعیی بناسیایە کە چەندە شەیدای عیلم و زانستە ، دەیزانیی کە بە زانست و فیقهی مەککە تێر ناخوات و ، تاسەی ناشکێ و ، مەگەر بەرەو مەدینە بکەوێتە رێ و بچێتە خزمەتی ئیمامی مەدینە و خاوەنی زانستی هەر حەوت فەقیهە گەورەکەی مەدینە ، ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس ـ خوا لێی رازیی بێ ـ تا زانستەکەی ئەویش وەرگرێ ، وەک ئیمام نەوەویی ـ رەحمەتی خوای لێ بێ ـ باسی کردووە .[٣١]

مەدینە لە هەموو شوێنێ زیاتر زانای پایەداری تیا هەڵکەوتن و ، دانیشتوانیشی لە دانیشتوانی هەموو ناوچەیەکی تر زیاتر دەستیان بە رەوشتە بەرزەکانەوە گرتبوو . چونکە کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی حونەین گەڕایەوە مەدینە دوانزە هەزار هاوەڵی چاک شارەزای لە مەدینەدا بەجێ هێشتن کە دە هەزاریان لە مەدینەدا مانەوە و تەنها دوو هەزاریان بە وڵات و ناوچەکانی تردا بڵاوەیان لێ کرد .. بۆیە دانیشتوانی مەدینە لە هەموو شوێنێ زیاتر شارەزای فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون و ، زیاتریش ئاگاداری هەڵس و کەوتی بوون . بۆیە ئیمام ( ربيعة الرأي )[٣٢] پشتی بە زانستی مەدینە دەبەست چونکە خەڵکێکی زۆر لە خەڵکێکی زۆرەوە یەک بە یەکی فەرموودەکان دەگێڕنەوە ، بە پێچەوانەی ناوچەکانی ترەوە کە یەکێک لە یەکێکەوە ریوایەت بکات . خۆ هەر کارێک ئەهلی مەدینە لە سەری بوونایە ئەوا رەبیعە وەری دەگرت . دوای ئەویش ئیمام مالیک وەهای دەکرد . زانایانی مەدینەش ئەوەندە کە پشتیان بە فەرموودەی مەدینە دەبەست پشتیان بە فەرموودەی شوێنەکانیتر نەدەبەست و ، لە دەستکاریی دەترسان . هەتا ئیمام مالیک وای دادەنا کە ئەگەر فەرموودەیەک لە مەدینە دوورکەوێتەوە لاواز و بێگیان دەردەچێت کە دەیفەرموو : « إذا جاوز الحديث الحرتين ضعفت شجاعته » . هەروەها

---

[٣١] تهذيب الإسماء واللغات ( ١ : ٧٤ ) .

[٣٢] ربيعة الرأي : کوڕی فەڕڕوخی تەیمیی‌یە . ئیمامێکی پایەداری فەرموودە و فەقیهێکی خاوەن ئیجتیهاد بووە . لەبەر ئەوەش نازناوی ( الرأي ) لێنراوە چونکە زۆر شارەزای قیاس بووە و لە مەدینەشدا ئەهلی فەتوا بووە . مامۆستای ئیمام مالیک بووە . ساڵی ( ١٣٦ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

کووفەی ناونابوو یانەی سککە لیّدان ، واتە وەكْ دیرهـەم و دینـار لیّدەدریّ وەهـا لـەویّش فەرموودە دروست دەکریّت . بۆیە ئەوەی حەزی لە عیلم و زانست بوایــە ئەبوایــە سـەری لـە مەدینـە بدایــە و ، بچوایەتــە خزمـەتی زاناکـانی و ، فـەرموودەی لـە ( حـــافیظ ) ەکـانی وەربگرتایە و ، هەرچییان ناتەواو بوایـە راستیان بکردایەتـەوە ، کـە یـەکیّ لەوانـە ئیمـام شافیعیی بوو .

جا وا ئیمام شافیعیی خۆی چیرۆکی ئەو گەشتەیمان بۆ دەگیڕیّتەوە :

« پاشان لە مەککە دەرچووم و ، چوومە بیابان لای هۆزی هوذەیـل ، تـا فـیّری زمانیـان ببم و ، خووڕەوشتیان وەربگرم ، کە زمان پاراوترینی عەرەبن . ئەفەرمویّ : حەڤدە سالْ لــە ناویاندا مامەوە کە لەگەلْ کۆچکردنیان کۆچم دەکرد و ، لەگەلْ بارخستنیان بارم دەخسـت . کاتیّکیش گەڕامـەوە مەککە دەستم بە شیعر وتن کرد و ، خووڕەوشـت و هـەوالْ و دەنـگْ و باسی رۆژانی عـەرەبەکانم دەگیّڕانەوە . ئەوە بوو پیاویّکی زوبەیریی لە ئامۆزاکـانم دای بـە لام دا و وتی : ئەبوعەبدوڵلاّ ! بە لامــەوە ســەختە ئـەم زمـان و رەوانبیّژیـی و زیرەکی‌یـەت فیقهی لەگەڵدا نەبیّت ، چونکــە بـەوە دەبیتـە سـەرداری سـەردەمەکەت . وتم : مەبەسـتت کیّیە مابیّ ؟ پیّمی وت : مـالیکی کوڕی ئەنەس ـ سـەرداری ئەو رۆژەی موسڵمانان ـ ( واتە بچۆ بۆ لای ئەویش ) . ئەفەرمویّ : ئەمە کەوتە دڵمەوە و ، هاتمە سەر ئەوە ( الموطـــــأ ) لەبەر بکەم . لای پیاویّکی مەککە خواستم و لــە نـۆ شـەودا لـە بـەرم کـرد . پاشـان چـووم بۆلای والیی مـەکـکە و نـامەیەکـم لیّ وەرگـرت بـۆ والیـی مەدینـە و بـۆ مـالیکی کـوڕی ئەنەس . ئەفەرمویّ : گەیشتمە مەدینە و نامەکەم گەیاندە دەست والیـی . کـە خویّندیـەوە وتی : رۆڵە! ئەگەر لەناو جەرگەی مەدینەوە بە پیّ و بە پیّخاوسیی بکەومە ریّ تـا بگەمـە ناوجەرگەی مەککە ، بە لامەوە ئاسانترە لەوەی تا دەرگای مالیکی کـوڕی ئەنـەس بـڕۆم . تا لە دەرگای ئەودا نەوەستم بە هیچ شیّوەیەکْ زەلیلیی بە خۆمــەوە نـابینم . منیـش وتم : خوا کاری ئەمیر بە چاكْ بگیّڕیّ . ئەگەر ئەمیر بیــەویّ بـا بنیّریّ بـە دوایدا هــەتا بیّـت .. وتـی : هەی‌هات ! خۆزگە کە خۆم و ئەوانەش وان لەگــەڵمدا سـوار دەبوویـن و تـۆز و خۆڵـی عـەقیق بە سـەرماندا دەباریی ، کـەمیّ لــە پیّویسـتی‌یەکانمان دەسـت گـیر ببوایــە . ئەفەرمویّ: بەڵیّنی عـەصرم دایێ و هەموومان سواربووین ، دەبەخوا هەر وا بوو کـە وتـی .. تۆز و خۆڵی عەقیقمان بەسەردا بـاریی . پیـاویّكْ چـووە پیّشـەوە و تەقـەی لـە دەرگـا دا ..

کەنیزەکێکی رەش هاتە دەرەوە و ئەمیر پێی وت : بە گەورەکەت بڵێ من وام لە دەرگادا..[٣٣]

ئەفەرموێ : کەنیزەکەکە چووە ژوورەوە و ، ماوەیەک دواکەوت . پاشان گەڕایەوە و وتی: گەورەم سەلامت لێ دەکات و ئەفەرموێ : ئەگەر پرسیارت هەیە لە پارچە کاغەزێک دا بینێرە ، وەڵامت بۆ دێتەوە . ئەگەر بۆ بیستنی فەرموودەشە ئەوا رۆژی کۆڕبەستن دەزانیت و مەوەستە . والیی بە کەنیزەکەکەی وت : پێی بڵێ : بۆ کارێکی گرنگ نامەی والیی مەککەم پێیە بۆی . ئەفەرموێ : چووە ژوورەوە و کە هاتە دەرەوە کورسییەکی بە دەستەوە بوو و دای‌نا . پاشان ئەوەندەمان زانیی مالیک کە پیرێکی باڵا بەرز بوو و ریشێکی سوننەتی هێشتبووەوە و طەیلەسانی لەبەرکردبوو ، بە سام و هەیبەتێکەوە هاتە دەرەوە و دانیشت .. والیی نامەکەی پێشکەش کرد . کە گەیشتە ( إن هذا الرجل من أمره وحاله ... فتحدثه وتفعل وتصنع ) نامەکەی فڕێ دا و پاشان فەرمووی : سبحان الله! ئەوە زانستی پێغەمبەری خوا ﷺ وای لێ هاتووە کە بە نامە بە دەست بهێنرێ ؟! ئەفەرموێ : چاوم لێبوو والیی نەی‌دەوێرا دەم بکاتەوە . لێی چوومە پێشەوە و وتم : خوا چاکت بۆ بکات . من پیاوێکی ئەوەی موطەللیبم و ئەمە حاڵ و بەسەرهاتمە .. کە قسەکانمی بیست ماوەی سەعاتێک لێم ورد بوویەوە ، مالیکیش خاوەنی فیراسەت بوو . پێمی فەرموو : ناوت چییە ؟ وتم : موحەممەد . فەرمووی : موحەممەد ! شەرمی خوا بکە و لە گوناه و تاوان دوورەپەرێز بە . تۆ پایەدار دەبیت .[٣٤] پاشان فەرمووی : بەسەر چاو. بۆ سبەینێ خۆشت و ئەو کەسەش کە بۆت بخوێنێتەوە بێن. وتم : خۆم دەخوێنمەوە . ئەفەرموێ : بۆ بەیانیی چووم بۆ لای . هەر لەبەر دەستم بە خوێندن کرد بۆی و کتێبەکەش

---

[٣٣] ئەو سەردەمە زانایان وەها رێزی خۆشیان و زانستەکەشیان دەگرت . دەبوا کاربەدەستان بچوونایەتە بەر دەرگای ئەوان.. دەگێڕنەوە کە خەلیفە رەشید دەنێرێ بە دوای ئیمام مالیکدا تا بێت و فەرموودەی بۆ بگێڕێتەوە .. واتە تا بە فەرموودەی نازیز ﷺ ئامۆژگاریی بکات .. تا قیامەت و مردنی بیر بخاتەوە .. کەچیی وەڵام دەداتەوە : پێویستە ئەو بێتە خزمەتی زانست . رەشید بەرەو ماڵی ئیمام دەکەوێتە رێ و پاڵ بە دیوارەکەوە دەدا ( هەتا دەرگای بۆ بکرێتەوە ) . مالیک ئەفەرموێ : ئەی ئەمیری ئیمانداران ! رێزگرتن لە زانست بەشێکە لە رێزگرتن لە پێغەمبەری خوا ﷺ . ئەوە بوو خەلیفە لەبەردەستی ئیمامدا دانیشت و ئەویش فەرموودەی بۆ خوێندەوە .

[٣٤] پیاوانی خوا کە کاری نوێخوازیی دینی خوایان پێدەسپێررێ هەریەکەیان بە دوای ئەو کەسەدا دەگەڕێ کە دەبێتە جێگری و کاری لە دەست وەردەگرێ و بە پاکیی و بێ‌لەکە دینی خوا دەگەیەنێ .. ئەمانە پەیوەندییەکی مەعنەویی لە نێوانیاندا هەیە . دیارە ئیمام مالیکیش چاوەڕوانە و چاوە و چاو دەکات ئەو کەسە بناسێ کە دەبێتە جێگری .. هەر کە سەیری ناوچاوی شافیعیی کرد ، خێرا بە نوور و بەصیرەتی ئیماندار بۆی دەرکەوت کە ئەمە پیاوی چاوەڕوان کراوە !

بە دەستمەوە بوو . هەرچیی سـام و هەیبـەتی مـالیکم لیٚ دەنیشـت و دەمویسـت بیٚبرم ، جوان خویٚندن و شارەزایی چاکم لە عەرەبیی‌دا سەرنجی رادەکیٚشا و ، دەیفەرموو : رۆڵـە! زیاتر بخویٚنە . تا ئەوەبوو لە چەند رۆژیٚکی کەم‌دا تەواوم کرد . پاشان لە مەدینـە مامـەوە هەتا مالیکی کوڕی ئەنەس کۆچیی دوایی کرد ..[٣٥]

جا هەرچەندە شافیعیی یەکجار دەستکورت بوو ، بەلاٚم غیرەتیٚکی ناوازەی خسـتە بـەر خۆی هەتا زانستی مەدینـەش بـە دەست بهیٚنیٚ . ئیمام مـالیکیش لەبەر خـاتری والیـی مەدینـە و مامۆسـتاکەی مەککـەی موسـلیمی کـوڕی خـالید ، کـە لیٚـی پاڕایـەوە ئـەویش نامەیەکی بداتیٚ بۆ ئیمام مالیکێ ، گلی دایەوە .

شافیعیی بە ئـاوات گەیشـت .. ئیمـام مـالیکێ بـە قوتـابیی قـەبووڵی کـرد .. ئـەمیش لەبەردەم مامۆستادا چۆکی دادا و دەستی بە خویٚندنی « الموطأ » کرد . سەرەتا ئیمام لـەوە دەترسا شافیعیی نەتوانیٚ بە چاکیی فەرموودەکانی پیٚغەمبەر ﷺ بخویٚنیٚتەوە ، بۆیە داوای لیٚکرد کەسیٚکێ بانگێ بکات تا بۆی بخویٚنیٚتەوە . بەلاٚم شافیعیی خۆی چاکێ ئامـادەی ئـەم دیواخانە ناوازەیە کردبوو ، لە خوای دەویست ئیمام وەری بگریٚ ، بۆیـە نـەکێ خویٚندنـەوەی کتیٚبەکەی رەوان کردبیٚ ، بـەڵکو بـە یـەکجاریی لەبـەری کردبـوو و بەوپـەڕی فەصاحـەت و زمان پاراوییەوە بۆی دەخویٚندەوە و ، هەرچیی بیٚویستایە لە شەرمی ئیمـامدا بووەسـتیٚ ، ئیمام غیرەتی دەخسـتە بـەری و داوای لیٚدەکـرد بـەردەوام بـیٚ ، هـەتا ئـەوەبوو بـە چـەند رۆژیٚکی کەم تەواوی کرد . شافیعیی هەر بـەوە نەوەسـتا بـەڵکو هـەموو زانسـتیٚکی ، وەکێ فەرموودە و فیقهـ و ئیجتیهاد و فەتوای هاوەلاٚن و تابیعین و هـەڵس و کـەوتی دانیشـتوانی مەدینەی لە ئیمام مالیکێ وەرگرت ..

سەرەڕای هەموو ئەمە سەری لە یەکێ بە یەکی مامۆستا و زانایـانی مەدینـە دا و چیـی زانستی قورئان و فەرموودەیان بەلاوە بوو وەری گرت .

ئەو کە زانستی سوفیانی کوڕی عویەینەی لە مەککە و ، زانستی مالیکی کوڕی ئەنەسـی لە مەدینە وەرگرتبیٚ ، مانای وایە زانستی حیجازی هەر هەموو بە دەست هیٚناوە..

شافیعیی خۆی ئەفەرمویٚ : « ئەگەر مالیکێ و سوفیان نەبوونایە زانستی حیجاز تیا دەچوو » .[٣٦]

---

[٣٥] کاتیٚ ئیمام مالیکێ کۆچی دوایی دەکات لە ساڵی ١٧٩ی کۆچیی‌دا تەمەنی ئیمام شافیعیی بیست و نۆ سـاڵ دەبیٚـت . ...وانە جیٚی خۆی بووە کە ئیمام مالیکێ لە ئاخر و ئۆخری تەمەنی‌دا بە پـەرۆش بـیٚ بـۆ ناسـینی ئـەو کەسـەی کـە دوای ...ی کاری نویٚخوازیی پیٚ دەسپیٚرریٚ ..

[٣٦] اداب الشافعي ( ٢٠٥ ) .

هەروەها ئەفەرموێ : « مالیكَ و سوفیان هـاوتـای یەكن بۆ دامەزراندنی زانستی حیجاز ».[٣٧]

ئیمام شافیعیی متمانەیـەكی زۆری بـە زانستی مەدینـە بـووە ، بـە تایبـەت زانستی ئیمـام مـالیكی مامۆستای ، بۆیـە شـانازیی دەكرد كـە خۆی سـەر بـە زانایـانی مەدینـــە بزانێـت و دەیفەرموو : كە وتم : « قال بعض أصحابنا » ، ئەوە مەبەسـت ئـەهلی مەدینەیـە ، بـەلاّم كـە وتم: « قال بعض الناس » ، ئەوە مەبەست ئەهلی عیراقە[٣٨] ..

مـــالیكَ لەبـــەر چـاوی شـافیعییدا ئەســتێرەیە و فەرمووشــیە : ئەگــەر لــە مالیكـــەوە فـەرمـوودەیەكَ گێڕایەوە بـۆت ئـەوا بە هەردوو دەســتت توند بیگـرە . هـەروەها دەربـارەی « الـــموطأ » دەری دەبڕێ كە ئەو ڕۆژە لەسـەر زەوییدا هیچ كتێبێكی فەرمووده لەو ڕاستترینە .[٣٩]

ئیمـام شـافیعیی ، وەكَ هـەلّگرێكـی ڕاسـتەقینەی قورئـان ، كــە كـاری بـەڕێوەبردنی ئیسلامی لە مالیكی پێشەوایەوە وەرگرتبـێ ، دەیزانیی لـەم كـارەدا كەسـێ پێش ئیمـام مالیكَ ناكەوێ ، بۆیە بە درێژایی تەمەنی هەر ستایشی دەكرد و ، ڕێیشـی نەئـەدا كەسـێ بە جۆرێ ناوی پێشەواكەی بەرێت .

شافیعیی متمانەیەكی زۆری بەو فەرموودانە هەبوو كە زانایانی هەردوو حەرەمی مەككیی و مـەدەنیی ، بـە تایبـەت ئیمـام مـالیكَ ، ریوایـــەتیان دەكــردن .. لــە هــەمان كـاتدا هــەر فەرموودەیەكَ لە غـەیری ئەواندا ریوایـــەت بكرایـە و ، لای ئـەوان شـوێنەوارێكی نەبوایـە، ئـەوا پشتی پێنەدەبەست ، ئەوەبوو دەیفەرموو :

« لوصح الإسناد ـ من حديث العراق ـ غاية ما يكون من الصحة ، ثم لم أجد له أصلاً عندنا ـ يعني بالمدينة ومكة ـ علي أي وجه كان ، لم أكن أعني بذلك الحديث ، علي أي صحة كان » .

زۆری بە دلّ بوو كە ئیمام مالیكَ بە وردیی فەرموودەی هەلّ ئەسـەنگاند ، هـەتا ئەگـەر گومانی لە هەندێكی ببوایە ، ئەوا وازی لە هەر هەمووی دەهێنا ، چونكە هــەر كەسـێ بـە لایەوە پلەی ( ثقة ) ی نەبوایە ریوایەتی لێوە نەدەكرد ..

شافیعیی ئەفەرموێ : بە مالیكی كوڕی ئەنەسیان وت : سوفیانی كوڕی عویەینە شتی وەهای بە لاوە هەیە كە لە زوهەرییەوە وەریگرتووە ئەو شتە بە لای تۆوە نیە . مالیكَ دەفەرموێ : جا دەبێ هەر فەرموودەیەكم بیست بیگێڕمەوە ؟! كەواتە من دەمەوێ ستەمیان لێبكەم .[٤٠]

---

[٣٧] آداب الشافعي ( ٢٠٥ ) .

[٣٨] آداب الشافعي ( ١٩٦ ) .

[٣٩] آداب الشافعي ( ١٩٦ ) .

[٤٠] آداب الشافعي ( ١٩٩ ـــ ٢٠٠ ) .

# گەشتی یەمەن

لەو ماوەیەدا کە شافیعیی لە مەدینەدا بوو جار و بار، لەبەر بێتاقەتیی ، سەری لە مەککە دەدایەوە ، چونکە نیشتمانی باوباپیرانی بوو و ، دایکی ژیر و دڵسۆزیشی لەوێ بوو کە هەردەم خەریکی ئامۆژگاریی کردنی بوو و ، مامۆستا بەرێزەکانیشی لەوێ بوون ، کە هەرگیز لە یادی نەدەکردن و چاکەیان لەبەر چاوی ون نەدەبوو.

لەو کاتەدا کە لە مەدینە بوو و لای ئیمام مالیک دەیخوێند هەندێ لە خزمانی دڵیان لێی هەڵ کەوت بوو و ، بە هیچ شێوەیەک دەستی یارمەتییان بۆ درێژ نەدەکرد ، بە مەرجێ شافیعیی یەکجار دەستکورت بوو ، بە رادەیەک کە خۆی دەری بریوە کە مەگەر خوای گەورە بزانێ هەژاریی چەندێ تەنگی پێ هەڵ چنی بوو . ئەو خزمانەی لەسەر ئەوە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ نەدەکرد کە گوایە شافیعیی لە مەزهەبی مەککە وازی هێناوە و چۆتە لای ئیمام مالک و لای ئەویش دەرس ئەخوێنێ .. بەڵام یەکێکیان بە ناچاریی صەد دیناری بۆ نارد .

بە بۆنەی ئەم دەستکورتییەوە شافیعیی ناچاری کارکردن دەبێت ، بۆ ئەمە گەشتێک بۆ وڵاتی یەمەن ئەکات .

حومەیدیی لە شافیعییەوە دەگێرێتەوە کە باسی گەشتەکەی یەمەنی دەکات :

« والییەکی یەمەن هاتە مەککە و پیاوێکی قورەیشیی دواندی تا بکەومە گەڵی بۆ یەمەن و ، دایکیشم پارەیەکی وەهای نەبوو تا بۆ خۆ رێک خستنم بمداتێ . ناچار خانوویەکم کردە بارمتە و لەگەڵیا رۆیشتم . کاتێ گەیشتین دەستم بەکار کرد بۆی و ، لە سەری سوپاس کرام و ، کاری چاک تریشی پێ سپاردم »[41].

کەرابیسییش لە ریوایەتێکی تردا دەگێرێتەوە کە ئیمام شافیعیی فەرموویە : موصعەب (ی زوبەیریی ) پێمی وت : هاروونوڕڕەشید فەرمانی بۆم دەرکردووە تا ببمە قازیی یەمەن ، ئایا تۆش دێیت لەگەڵماندا ، بەڵکو خوا ، لە جیاتیی یارمەتیدانی ئەو

---

[41] توالي التأسيس ( ٦٩ ) . ئەو والییەش ( حماد البربري ) بووە .

پیاوە ، دەستی یارمەتییت بۆ درێژ بکات ؟ مەبەستی لەو پیاوە خزمەیەتی کە صەد دینـار یارمەتیی بۆ ناردبوو و ، لەسەر ئەوەش کە چووبووە مەدینە و لە خزمەتی ئیمام مـالیکدا دەرسی خوێندبوو رەخنەی لێ گرتبوو .

ئەفەرموێ : ئەو بۆ کاری قەزاوەت بەرەو یەمەن کەوتە رێ و ، منیش لەگەڵیا رۆیشتم .

کە دەگاتە یەمەن سەرەتا کارێکی بچکۆلەی پـێ دەسپێررێ و ، لەبـەر دەسـتپـاکیی و کـارجوانیی سوپاسـی دەکـەن و کـاری چـاکتریشی پـێ دەسـپێرن و ناوبـانگی زانـایی و موسڵمانیی لەناو خەڵکدا بلاّوە دەکات ، بە رادەیەک کە دەنگ و باسی دەگاتەوە مەککـە و خەڵکیی سوپاس و ستایشی دەکـەن ، سـوفیانی کـوڕی عویەینـەی مامۆستاشـی روو بـە رووی ئیمام شافیعیی دەریدەبڕێ کە رەوشـت جوانیـی ئـەو بـلاّوەی کـردووە و ، پێیشـی را دەگەیەنێ کە نەگەڕێتەوە سەرکارەکەی . هەروەها مامۆستایەکی تری مەککەشی کە نـاوی ئیبراهیمی کوڕی ئەبویەحیا دەبێت داوای لێدەکات واز لە کـار کـردن بـهێنێ ، هەرچـەندە موحتاجیش بێت . چونکە موسڵمانان زیاتر بـە خزمـەتی ئـەو موحتـاجن . ئـەم موحتـاجی کـاری دنیایـە و موسـڵمانانیش موحتـاجی کـاری قیامـەتن . چونکـە زیرەکیـی و زانسـتی شافیعیی چـاوەڕوانی ئـەوەیان لێدەکـرا کـە پیـاوێکی سـەردار و پێشـەوای لێ دەرچـێ بـۆ موسڵمانان .

پاشان کاروباری نەجرانی پێدەسپێررێ کـە لـەوە دەچـێ بووبێتـە قـازیی ئـەو ناوچەیـەی یەمەن . خەڵکەکە فێر بووبوون هەر کاربەدەستێکیان بۆ بهاتایە لێی دەچوونـە پێـش و بـە بەرتیل فریویان دەدا و لە رێی راست دەیان ترازان . جا ویستوویانە ئیمام شـافیعییش وا لێ بکەن ، بەلاّم کە ئەو دەیەوێ بە داد و یەکسـانیی لەگـەڵیان بجوولێتـەوە ، پێیـان نـاخۆش دەبێت و لە مەککە شکاتی لێ دەکرێ و رەوانەی عیراق دەکرێ .[٤٢]

لە ریوایـەتێکی تـردا ئیمـام دەریدەبڕێ کـە لـە یەمـەن بـە جوانیـی کـاری کـردووە تـا ناوبانگی دەرچووە ، بەلاّم والی‌یەکی ستەمکاری لێبووە ، کە ئیمام ویستوویەتی لـە ستەم و ناڕەوایی دەستی بگرێ رقی لـە ئیمـام هـەڵ گرتـووە و بـە تۆمـەتی دژایـەتیی دەوڵـەت و پشتگیریی عەلەوی‌یەکان تـاوانبـاری دەکـات و ، نـاوی تێکـەڵ بـە نـاوی چـەند کەسێکی عەلەویی دەکات و خەلیفە ئاگادار دەکات کە شافیعیی لە فەرمانیدا نیە .

---

[٤٢] توالي التأسيس ( ٦٩ ) .

ئەو والی‌یە ( حماد البربري ) یە کە لە ساڵی ١٨٤ی کۆچیی‌دا ڕەشید کردوویەتیە والیی مەککە و یەمەن و هەر لەو ساڵەش‌دا بوو کە شافیعیی لە یەمەن کار بە دەست دەگرێت ..

ڕەشیدیش وەڵامی نامەکەی والیی وەها دەداتـەوە کـە ئـەو عەلەوی‌یانـە و شـافیعییش لەگەڵیانا حەواڵەی بەغدادی پایتەختی دەوڵەتی عەبباسیی بکات .

بەڵێ لە ساڵی ١٨٤ی کۆچیی‌دا شافیعیی بە باڵی بەستە حەواڵەی عیراق دەکرێت .. کـە گەیشتە بەغداد فەرمانی بەسەردا درا کە شاری بەغداد بەجێ نەهێڵێ و هـەرکاتێ خەلیفـە داوای کرد با ئامادە بێت .. بەمە لە بەغداد مایەوە و ، ئـەمیش ئـەم مانەوەیـەی بـە هـەل زانـی و دەسـتی کـرد بـە وەرگرتنـی زانسـت ، بـە تایبـەتیی زانسـتی موحەممـەدی کـوڕی حەسەنی قوتابیی ئیمام ئەبوحەنیفە ـ خوا لێی ڕازیی بێ ـ .. ئەوەبوو چیـی پـارەی پـێ بـوو هەمووی لە پێناوی کتێبەکانی موحەممەددا خەرج کرد . بەڵام بە چاکیی ئارامی دەگرت و متمانەیەکی زۆری بە خوای گەورە هەبوو .. لە لایەکەوە دەست کورت و گیرفان خاڵیی ، لە لایەکی ترەوە بێئاگا وەها تاوانبار کراوە کە خەلیفە دەست بەجێ بی‌کـوژێ .. بـەم حاڵـەوە چاوەڕوانیی کۆمـەکیی خـوا بـوو و ، لـە هـەمان کـاتدا بـۆ وەرگرتنـی زانیـاریی و ڕاسـت کردنەوەی زانستی عیراق ساتێک وچانی نەئەدا ..

شافیعیی ئەفەرموێ : لـە پێنـاوی کتێبـەکانی موحەممـەدی کـوڕی حەسـەن‌دا شـەصت دینارم خەرج کرد ، پاشان بە وردیی سـەرنجم دان . ئـەوەبوو لـە پـاڵ هـەر مەسـئەلەیەکدا فەرموودەیەکم دانا[42] . واتە بۆ ڕاستکردنەوەی مەسئەلەکە .. چونکە زانسـتی عـیراق وەک زانستی حیجاز نەبوو ، کەمتر فەرموودە بەکاردەهێنرا .

شافیعیی خواناسانە و بە پاکیی و بە ئیخلاصەوە لە بەغداد مایەوە ... ئەوەندە لەگـەڵ خوادا ڕاستی دەکرد هەتا خوا دەرووی لێ کردەوە .

کاتێک کە برانە ژوورەوە لای خەلیفە ڕەشید ، خەلیفە داوای شمشێری کـرد و فـەرمانی دا لە ملی عەلەوی‌یەکانیان دا . پاشان بە گلەیی‌یەوە ڕووی لە شافیعیی کرد و وتی : کـاکی شافیعیی ! لێمان هەڵ گەڕایتەوە و لە دژمان پشتگیریی عەلەوی‌یەکانت کرد ؟!

شافیعیی فەرمووی : ئەی ئەمیری ئیمانداران ! پەلـە مەکـە تـۆ بـانگ‌کـەری و منیـش بانگ‌کراو .. تۆ هەرچیت بوێ توانات بەسەر مندا هەیە ، بـەڵام مـن هـەرچیم بـوێ بەسـەر تۆدا توانام نیە .. ئەی ئەمیری ئیمانداران ! ڕات چۆنە دەربـارەی دوو پیـاو : یـەکێکیان بـە

[42] آداب الشافعي ومناقبه ( ٣٤ ) .

برام دەزانێ و ، یەکێکیشیان بە بەندەم دەزانێ ، دەبێ کامیانم خۆش بوێ ؟ وتی : ئەوەیان کە بە برات دەزانێ . وتم : دەی ئەوە تۆیت ئەی ئەمیری ئیمانداران . ئەفەرموێ : پێمی وت : چۆن ؟ وتم : ئەی ئەمیری ئیمانداران ! ئێوە لە نەوەی عەبباسن و ئەوانیش لە نەوەی عەلیین و ، ئێمەش نەوەی موطەللیبین . جا ئێوەی نەوەی عەبباس بە برای خۆتانمان دەزانن و ئەوانیش بە بەندەی خۆیانمان دەزانن ..

بەمە تووڕەیی‌یەکەی خەلیفە نەما و ، رێکێ دانیشت و داوای لە ئیمام کرد کە ئامۆژگاریی بکات . ئەویش ئەوەندەی ئامۆژگاریی کرد هەتا دەستی بە گریان کرد . پاشان فەرمانی دا پەنجا هەزار دیرهەمی بدەنێ .[٤٤]

لەو ماوەیەدا کە ئیمام شافیعیی لە بەغداد بوو موحەممەدی کوڕی حەسەن زۆر رێزی لێدەگرت ، بە رادەیەکێ کە ئەبوحەسسان وتوویە : نەمدیوە موحەممەد رێز لە هیچ کەسێکێ بگرێ وەکێ رێزگرتنی لە شافیعیی .[٤٥]

شافیعییش بە چاوی رێزەوە سەیری موحەممەدی کوڕی حەسەنی کردووە . شافیعیی خۆی زۆر زمان پاراو بووە کەچیی لە زمانپاراویی موحەممەدیش زۆر رازیی بووە کە فەرموویە : « هەرکاتێ قسەی بکردایە وەهات بە بیردا دەهات کە قورئان لەسەر زمانی ئەو هاتۆتە خوارەوە ».[٤٦]

هیچ کام لەوانەی کە باسی ئەم گەشتەی شافیعی‌یان گێڕاوەتەوە دەریان نەخستووە لەم گەشتەی یەکەم جاری‌دا لە بەغداددا چەند ماوەتەوە ، بەڵام وەکێ دەردەکەوێ زۆر ماوەتەوە تا زانست لە مامۆستایان وەربگرێت و کتێبەکانی موحەممەدی کوڕی حەسەن بنووسێتەوە و لەگەڵ زانایان و فەقیهەکاندا بەرابەرکێی زانستیانە بکات . دەگونجێ تا نزیکی کۆچی دوایی موحەممەدی کوڕی حەسەن واتە تا ساڵی ١٨٩ی کۆچیی مابێتەوە ، پاشان گەڕابێتەوە بۆ مەککە ..

کاتێکیش کە بەغدادی بەجێ‌هێشت کاریگەری‌یەکی وەهای لە دڵ و دەروونی دۆستانی و ناحەزانی‌دا بەجێ هێشت کە هەرگیز لە بیر نەچوێتەوە ، بە رادەیەکێ کە هەر هەموویان شاهێدی‌یان لەسەر ژیریی و تێگەیشتن و زیرەکیی ئەودا ..

---

[٤٤] معجم الأدباء ( ١٧ ـ ٢٨٧ ) ، توالي التأسيس ( ٧٠ ) .
[٤٥] توالي التأسيس ( ٧١ ) .
[٤٦] الجواهر المضيئة ( ٢ : ٤٣ ) .

موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی صەغغانیی دەربارەی شافیعیی پرسیار لە یەحیای کوڕی ئەکثەم [٤٧] دەکات ، ئەویش لە وەڵامدا دەریدەبڕێ کە عەقڵ و تێگەیشتن و زیهنی قورەیشیی و ، عەقڵ و تێگەیشتن و مێشکی بێگەرد بووە و ، شتی زوو پێکاوە . خۆ ئەگەر لە فەرموودەدا قووڵ بوایەتەوە ئەوا ئوممەتی ئیسلام پێویستیی بە هیچ زانایەکی تر نەدەبوو کە دەیوت : « كنا عند محمد بن الحسن في المناظرة كثيراً ، فكان الشافعي رجلاً قرشي العقل والفهم والذهن ، صافي العقل والفهم والدفاع ، سريع الإصابة . ولو كان أمعن في الحديث لاستغنت به امة محمد عن غيره من العلماء » [٤٨].

---

[٤٧] [illegible]یای کوڕی ئەکثەم : قازییەکی پایەدار بووە ، یەکێ بووە لە فەقیهە سەردارەکان .. پەیوەندیی بە خەلیفە [illegible]ونەوە کردووە . ئەویش کردوویەتە قازیی بەصرە و پاشان سەرۆکی قازییانی بەغداد ، سەرەڕای ئەوەی کە کاروباری [illegible] پێسپاردبوو . ساڵی ( ٢٤٢ )ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[٤٨] [illegible] التأسيس ( ٥٦ ) .

# گەڕانەوەی بۆ مەککە

خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی ئیمام شافیعیی لەو داوە رزگار کرد ، کە بە بوختانی والیی یەمەن خەریکێ بوو خەلیفە لە ملی بدات .. ئەوە بوو لەو ماوەیەدا کە لە عیراق مایەوە زانستێکی زۆری دەست کەوت ، کە گەڕایەوە بۆ مەککە باری وشترێک زانستی ( أهل الـــرأي ) پێ بوو سەرەڕای روون کردنەوە و تێبینییەکانی قوتابییە گەورەکەی ئیمام ئەبوحەنیفە ، موحەممەدی کوڕی حەسەن .

بەمە زانستی حیجازی کۆکردەوە ـ کە زۆربەی زانستی سوننەت و شوێنەوار و هەڵس و کەوت بوو ـ و ، زانیاریی ( أهل الرأي ) عیراقیشی ـ کە بریتی بوو لە فیقه و قیاس و یاسا وەرگرتن ـ دەستگیر بوو ..

ئەو هەمووە ماوەیە کە لە بەغداد مایەوە ، بە هەموو هێزیکیەوە بەرگریی لە مەزهەبی مالیکی ئیمامی دەکرد و ، لەگەڵ ئەهلی عیراقدا بەرابەرکێی دەکرد و بەڵگەی لەسەر راستیی مەزهەبەکەی دەهێنایەوە . تا ئەوە بوو ئەم بەڵگە هێنانەوەیە خستیە سەر ئەو رێیە کە بەڵگەکانی بە جوانیی هەڵ بسەنگێنێ و دەست بداتە هەڵبژاردن و جیاکردنەوەیان تا ئاگاداری بەڵگەی بە هێز و لاواز و راست و هەڵە ببێ ..

ئەم بۆچوونەی کاتێ بە دڵدا هات کە گەڕابوویەوە مەککە و لە هەردوو زانستەکەی حیجاز و عیراقدا تەواو قووڵ بووبوویەوە و ، بە وردیی سەرنجی بناغە و لق و پۆپی مەزهەبەکانی دەدا .. ئەوە بوو لە ئەنجامدا بیری ( ئیجتیهادی موطلەق ) بەسەریدا هات .. چونکە ئەم بە کۆمەکیی و پشتگیریی خوای گەورە زانستی زانایانی بەرو دوای وەرگرتووە و ، ئاگاداری رای هەموو فەقیهـ و فەرموودەناسێکە و ، دوای هەڵسەنگاندنیش خاڵی هێز و لاوازیی هەریەکەیان دیاریی کردووە . کەواتە ئەمڕۆ ئەرکی سەرشانی ئەمە کە لە هەموو زانستێک بەڵگە بەهێز و رێک و پێکەکان ، کە لە هەموو بەڵگەیەک زیاتر لە قورئان و سوننەتەوە نزیکن ، هەڵ ببژێرێ ، تا راستترین بۆ چوونی دەست بکەوێ ..

لێرەدا ئیمام شافیعیی وازی لە بەرگریی لە هەموو شتێک هێنا بۆ ئەوەی تەنها بەرگریی لە حەق بکات .. وازی لە خۆیشی و لە هەموو ئیمام و پێشەوایەکیش هێنا کە دەمارگیریی بۆ بکا و هەوڵی سەرخستنی بدات ، بە هەموو دڵێکەوە هاتە سەر ئەوە کۆمەکی حەق بێت تا ببێتە پاسەوانێکی ئەمین بۆ شەریعەتی خوا و پارێزگاریی لێ بکات تا بە جوانترین شێوە بکەوێتە بەردەستی موسڵمانان .

بەڵێ وەک زانایان دەگێڕنەوە شافیعیی زانستی عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی جورەیجی [49] لە چوار مامۆستا وەرگرتووە : لە موسلیم ی کوڕی خالید و ، سەعیدی کوڕی سالم و ، عەبدولمەجیدی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو رواد و ، عەبدوڵڵای کوڕیحاریثی مەخزوومیی . لەولاوە سەرۆکایەتیی فیقهی مەدینە کەوتە دەست ئیمام مالیک و ، ئەوە بوو شافیعیی چووە خزمەتی و چیی زانستی لابوو وەری گرت .. هەروەها سەرۆکایەتیی فیقهی عیراقیش کەوتە دەست ئیمام ئەبوحەنیفە و زانستی ( أهل الـرأي ) عیراقیشی لە موحەممەدی کوڕی حەسەنی قوتابیی ئەبوحەنیفە وەرگرت ..

بە وەرگرتنی ئەم هەموو زانستانە ، شافیعیی پیاوێکی تاقانەی لێ دەرچوو .. بە رادەیەک کە توانیی بەردی بناغە بۆ هەموو زانستەکاندا بنێ .. دەستی دایە دانانی ( أصول ) و نەخشەکێشانی ( قواعد ) بە شێوەیەک کە هەموو لایەک ، چ دۆستان و چ نەیاران ملکەچی زانستەکەی بوون و ، ناوبانگی هەموو جیهانی ئیسلامیی پڕ کرد و ئەو پیاوەی لێ دەرچوو کە تا ئێستاش موسڵمانان بە پێشەوای خۆیانی دەزانن ..

کە شافیعیی بە لێهاتنی تەواو و زانستی رێک و پێکەوە توانیی جڵەوی ئیجتیهاد بە دەست بگرێت و ، بە سەلیقەی تەواوەوە ( أصول ) و ( قواعـد ) دابرێژێ ، لە مزگەوتی حەرامیشدا لە مەککە ئەڵقەیەکی دەرس وتنەوەی دانا .. کە ناوبانگی بە هەموو لایەکدا رۆیشت ، شەیدایانی زانست روویان لە مەککە نا ، تا گوێ لە شافیعیی بگرن و لە نەخشە رەنگینەکانی کەڵک وەربگرن ..

یەکێ لەوانەی کە کەڵکی لە ئیمام شافیعیی وەرگرت ، ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو ، کە بۆ حەجکردن سەری لە مەککەدا و هاتە مزگەوتی کەعبەوە تا بە خزمەتی گەورە پیاوانی فیقهـ و حەدیث بگات بە تایبەت سوفیانی کوڕی عویەینە . کە ئەڵقەی دەرسەکەی

---

[49] ئیبن جورەیج : لە سەردەمی خۆیدا فەقیهی حەرەمی مەککیی و ، ئیمامی ئەهلی حیجاز بووە . یەکەم کەسێکە لە مەککەدا بۆ زانستە شەرعیەکان کتێبی دانا بێ .. لە بنەڕەتدا خەڵکی رۆم بووە و ، بۆتە مەوالیی قورەیش . ساڵی ١٥٠ ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

شافیعیی بینی و ، خۆیشی لە عیراقدا لەوەو پێش شافیعیی دیی بوو و بۆی سەلما بوو کە خاوەنی زیرەکییەکی کەم وێنەیە و ئەو ( أصول ) و ( قواعد )انەی کە لەوی بیستبوون لە کەسی تری نەبیستبوون ، لەبەر ئەمە وازی لە کۆڕی هەر هەموو ئەو زانا پایەدارانە هێنا و خۆی گەیاندە کۆڕی شافیعیی .

موحەممەدی کوڕی فەضلی فەڕڕاء ئەڵێت : گوێم لە باوکم بوو کە دەی وت: « لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا چووم بۆ حەج و ، لەوێ لە یەک شوێندا بارمان خست . بەیانیی دەرچوو و منیش بە دوایدا دەرچووم . هەموو مزگەوت بە دوایدا گەڕام نە لە کۆڕی ئیبن عویەینە و نە هیچ کەسی تردا نەم دی ، تا کە دۆزیمەوە دەبینم لەلای ئەعرابییەک دانیشتووە . وتم : ئەبوعەبدوڵڵا ! وازت لە ئیبن عویەینە هێناوە و هاتوویت بۆ لای ئەمە ؟! پێمی فەرموو : بێدەنگ بە . ئەگەر لە شوێنێکدا فەرموودەیەکت لە کیس بچێ لە شوێنێکی تردا دەستت دەکەوێت . بەڵام ئەگەر عەقڵی ئەمەت لە کیس بچێ دەترسم دەستت نەکەوێتەوە .. کەسم نەدیوە لەم گەنجە لە قورئان شارەزاتر بێت . وتم : ئەمە کێیە ؟ فەرمووی : موحەممەدی کوڕی ئیدریسە » .[50]

ئیسحاقی کوڕی راهویە[51] وتوویە : لە مەککەدا لەگەڵ ئەحمەددا بووم ، پێمی فەرموو : « وەرە با پیاوێکت پیشان بدەم کە بە چاوی خۆت پیاوی وەهات نەدیبێ » . شافیعیی پیشان دام .[52]

حومەیدییش وتوویە : « ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە مەککەدا بە بۆنەی سوفیانی کوڕی عویەینەوە لەلامان مایەوە . رۆژێکیان پێمی فەرموو : پیاوێکی قورەیشیی لێرەدایە کە شارەزایی و زانستی بە لاوەیە . منیش وتم : ئەوە کێیە ؟ فەرمووی : موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعییە . ئەوە بوو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە عێراقدا چوو بووە خزمەتی .. کۆڵی نەدا هەتا رای کێشام بۆ لای » .

---

[50] توالي التأسيس ( ٥٦ )

[51] ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موخەللەدی تەمیمیی میروەزییە ، لە سەردەمی خۆیدا زانای خۆراسان بووە . یەکێکە لە گەورە پیاوانی لەبەرکردنی حەدیث . پلەی ( ثقة ) ی وەرگرتووە . ( دارمـــي ) وتوویە : ئیسحاق بە هۆی راستگۆیی خۆیەوە بۆتە سەرداری ئەهلی مەشریق و مەغریب . ساڵی ( ٢٣٨ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە ..

[52] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٢ ) .

بیشری مورِیسییش کە قەدەریی بووە و کەس نەیتوانیوە بەرابەرکێی لەگەڵدا بکات، لەو ماوەیەدا لە مەککەدا چاوی بە شافیعیی دەکەوێ و لە بارەیەوە ئەڵێت : نیوەی عەقڵی ئەهلی دنیا لە لای ئەمە .

حەسەنی کوڕی موحەممەدی زەعفەرانیی دەگێڕێتەوە و ئەڵێت : « ئامادەی کوڕی بیشری مورِیسیی دەبووین ، بەڵام نەماندەتوانی بەرابەرکێی لەگەڵدا بکەین . ئەوە بوو چووین بۆ لای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و پێمان وت : ماوەمان بدە با ( الجامع الصغير )ی ئەبوحەنیفە لەبەر بکەین تا ئەگەر بەرامبەرمان وەستان وەڵامیان بدەینەوە . فەرمووی: ئارام بگرن . ئێستە ئەو پیاوە موطەللیبییەی کە لە مەککەدا دیومە دێتە لاتان . ئەڵێت: شافیعیی هاتە لامان . چووین بۆ لای و ، داوای هەندێ کتێبی خۆیمان لێ کرد ،، ئەویش کتێبی سوێند لەگەڵ بوونی شاهیدی دا پێمان . منیش لە ماوەی دوو شەودا دیراسەم کرد ، پاشان چووم بۆ لای بیشری مورِیسیی و لێی چوومە پێشەوە . کە بینیمی وتی : ئەی خاوەنی حەدیث ، بۆچیی هاتووی ؟ وتم : واز لەوە بێنە . بەڵگەی بەتاڵبوونەوەی سوێند لە کاتی بوونی شاهێددا چییە ؟ بەرابەرکێم لەگەڵدا کرد و بەزاندم . وتی : ئەمە لە ژێریی خۆتانەوە نیە . ئەمە قسەی ئەو پیاوەیە کە لە مەککەدا دیومە .. نیوەی عەقڵی دنیا لە لای ئەوە » .[٥٣]

بەرە بەرە ئەڵقەی دەرس وتنەوەکەی شافیعیی لە مزگەوتی حەرامدا زیادی دەکرد ، چونکە وەڵامی هەموو جۆرە پرسیارێکی زۆر بە رێک و پێکیی تێدا دەدرایەوە .

عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی هاروونی فریابیی ئەڵێت : لە مەککەدا چاوم بە ئەڵقەیەکی گەورە کەوت کە پیاوێکی بەسەرەوە بوو . کە پرسیارم لە بارەیەوە کرد ، وتیان: ئەوە موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعییە . جا گوێم لێ بوو دەیفەرموو : لە بارەی هەر شتێکەوە پێتان خۆشە پرسیارم لێ بکەن ، تا وەڵامتان بدەمەوە . ئایەتی قورئان بێت، سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرموودەی هاوەڵان بێت . لە دڵی خۆمدا وتم : ئەم پیاوە بەجەرگە . پاشان پرسیارم لێ کرد : لە بارەی کەسێکەوە لە ئیحرامدا بێت و زەردەواڵە بکوژێت دەڵێیت چیی ؟

---

[٥٣] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣٠٤ ) .

فەرمووی : خوای گەورە فەرموویە : ﴿ وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا ﴾[٥٤] (الحشر : ٧) . سوفیانی کوڕی عویەینەش لە عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیرەوە ، لە رەبیعیەوە ، لە حوذەیفەوە دەگێڕێتەوە وتوویە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : ( اقتدوا باللذين مِن بعدي أبي بكر و عمر ) [٥٥] هەروەها سوفیانی کوڕی عویەینە ، لە ( مسعر )ەوە ، لە قەیسی کوڕی موسلیم ەوە ، لە طاریقی کوڕی شیهابەوە بۆمانی گێڕایەوە کە عومەر ـ خوا لێی رازیی بێ ـ فەرمانی داوە ئەو کەسەی لە ئیحرامدا بێت زەردەواڵە بکوژێت .[٥٦]

ئیمام شافیعیی لەم تەمەنەیدا ، وەک کەسێکی زۆر بەوەفا لە کۆڕی مامۆستای جارانی و فەرموودەناسی حەرەمی مەککیی ، سوفیانی کوڕی عویەینە دوا نەدەکەوت، لەولاوە ئیبن عویەینەش متمانەیەکی باشی بە زانست و فیقهی شافیعیی دەکرد ، بگرە لەبەردەم خەڵکدا پرسیاری مانای ئایەتێک ، یان فیقهی فەرموودەیەکی لە شافیعیی دەپرسیی ، ئەویش وەلامێکی وەهای دەدایەوە کە فێنکیی بە دڵی مامۆستاکەی دەگەیاند و ، خەریک بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرێتەوە .

ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبباس دەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لە کۆڕی ئیبن عویەینەدا بووم و شافیعییش لەوێ ئامادە بوو .. ئەوە بوو سوفیان ئەو فەرموودەیەی صەفیە و دوو پیاوەکەی لە زوهەرییەوە گێڕایەوە [٥٧] ، کە تیایدا هاتووە : « إن الشيطان يجرى من الإنسان مجرى الدم » [٥٨] جا ئیبن عویەینە بە شافیعیی وت : ئەبو عەبدوڵلا ! فیقهی ئەم فەرموودەیە چییە ؟ فەرمووی : ئەگەر ئەو خەڵکە پێغەمبەری خوایان ﷺ تۆمەتبار بکردایە ، ئەوا بەو تۆمەتبارکردنەیان کافر دەبوون ، بەلام پێغەمبەری خوا ئەدەبی خەڵکانی دوای خۆی دادا ، کە فەرمووی : ئەگەر ئێوە وەها بوون ، ئەوا ئاوەها بکەن هەتا زەنتان پێ نەبرێ ، نەک ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ـ کە ئەمین و دەست پاکێکە

---

[٥٤] قورئانی پیرۆز فەرمان بەسەر ئیمانداراندا دەدات کە بە چاکیی بە گوێی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن : چ فەرمانێکی دا با جێ بەجێی بکەن و ، لە چ شتێکیش دووره پەرێزی کردن با واز لەو شتە بهێنن ..

[٥٥] فەرمان بە ئیمانداران دەکات کە ئیقتیدا بە ئەبوبەکر و عومەر بکەن .

[٥٦] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١٦ ) .

[٥٧] مەبەست لەو فەرموودەیەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ صەفیەی هاوسەریدا دەبێت و تووشی دوو پیاوی موسڵمان دەبن و ئاگاداریان دەکات کە ئەم ئافرەتەی وا لەگەڵیا هاوسەریەتی .

[٥٨] دەری دەبڕێ کە شەیتان وەک خوێنی ناو دەمار لە مرۆڤ جیا نابێتەوە و کۆڵی لێ نادات ..

۱۰ا وەحی بۆ ناردووە ـ تۆمەتبار بکرێـت . ئیبن عویەینـە وتـی : ئـەبو عـەبدوڵڵا ! خـوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، ئەوەی پێمان خۆشە لە تۆوە دەیبیستین .[٥٩]

لە ئەڵقەی دەرسوتنەوەکەی مزگەوتی حەرامدا ، بە بۆنەی ئەو باسە گرنگ و نوێیانـەدا کە شافیعیی لێیان دەدوا ، ناوبانگی زیاتر بڵاوەی دەکرد ، بە رادەیەک ناوبـانگی زانایـەتیی گەیشتە عـیراق و بـۆ زانایـان دەرکـەوت کـە شـافیعیی چ زانسـتێکی بـەنرخ لـەوێ پـەخش دەکات ، تا ئەوەبوو حافیظی عیراق ئیمامی ناودار عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدیی نامەی بۆ مەککە بـۆ شـافیعیی نـارد و داوای لێ کـرد ـ بـەو گەنجییـە ـ لـە بـارەی ماناکـانی قورئانەوە کتێبێک بنووسێ و ، چیی هەواڵی وەرگیراو و بەڵگەی یەکدەنگیی هەیە تیایدا کۆیان بکاتەوە و ، ناسخ و مەنسووخی قورئان و حەدیثیشی تێدا دیاریی بکات . ئـەویش کتێبـی ( **الرســالة** ) ی بـۆ ئـەو مـەبەستە نووسیی و ،[٦٠] چونکـە وەڵامــی نامەکـەی عـەبدوڕڕەحمان بـوو نـاوی نـا ( الرسـالە ) و ، حـــاریثی کـوڕی سـورەیجی **نـەققالی** خوارەزمیـی، پاشـان بـەغدادی بـۆی بـرد ، لـە بـەر ئـەوە ئـەویش نازنـاوی ( **نقـــالی**ی ) وەرگرت[٦١] .

---

[٥٩] توالي التأسيس ( ٥٤ ) .

[٦٠] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١٣ ) . عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدیی پێشەوایەکی یەکجار خواناس بووە . فەرموودەی لـە شوعبە و ثەوریی و مالیک وەرگرتووە . ئیمام شافیعیی لەم بارەیەوە ئەفەرموێ : لە دنیادا پێنازانم کەسێک هاوشانی بێت . سالی ( ١٩٨ )ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[٦١] نقال : لە شافیعیی و ، حەممادی کوڕی سلمە و ، کوڕی عویەینە و غەیری ئەوانیشەوە فەرموودەی ریوایەت کردووە . سالی ٢٣٦ ی کۆچیی دوایی کردووە .



# دووهەم و سێهەم گەشتی بۆ عێراق

بۆ جاری دووهەم ئیمام شافیعیی لە ساڵی ١٩٥ ی کۆچییدا گەشتی بۆ بەغداد کرد .. ئەم گەشتەی چ بۆ خۆی و ، چ بۆ موسڵمانان زۆر بە پیت و بەرەکەت بوو ، هەرچەندە گەشتێکی کورت بوو و تەنها دوو ساڵی خایاند ..

ئەم گەشتەی زۆر پێویست بوو ، چونکە بە راستیی هەردوو قوتابخانەکەی ئەو رۆژە : قوتابخانەی ( حدیث ) و ، قوتابخانەی ( رأي ) ، چالاکیی رێک و پێکیان نەبوو .. زانایانی قوتابخانەی ( حدیث ) هەموو زانستێکیان بریتیی بوو لە سەرنجدانی رواڵەتی دەرەوەی فەرموودە و خەڵکێکی زۆریش ، بە هیوای شوێنکەوتنی سوننەت ، شوێنیان کەوتبوو .. لە هەمان کاتدا زانایانی ( رأي ) ش خەریکی کارێکی بێسەروبن بوون ، کە تەنها مەبەستیان بەرگرییکردن بوو لەو را و بۆچوونانەی کە بلاویان کردبوونەوە و ، هێزی دەوڵەتیش لە پشتیان بوو .. ئیمامی شافیعییش هەرجاری پێشوو گەیشتبووە ئەو قەناعەتە کە هیچ قوتابخانەیەکیان کەڵکی شوێنکەوتنی پێوە نەماوە .. بۆیە رایەکی ئیجتیهادیی بۆ خۆی پێک هێنا تا لە ناتەواویی هەردوولا خۆی دەرباز بکات .

بەڵام سەردانی یەکەمی لە بەغداد لە کوێ و سەردانی دووهەمی لە کوێ ؟

جاری یەکەم بە تاوانباریی و قۆڵبەستراویی دەبرێتە بەردەم خەلیفە . بەڵام جاری دووهەم ستایشێکی زۆری کەڵەزانایانی ئیسلام سەرانسەری وڵاتی ئیسلامی ، بە تایبەت بەغدادی پایتەختی پڕکردووە .. کەڵەزانای وەک ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ، ئیسحاقی کوڕی راهویە و ، بیشری موریسیی و ، عەبدورڕەحمانی کوڕی مەهدیی ستایشی شافیعییان کردووە و ، دانیان بە زانستی بەرزی ئەودا ناوە ..

بەڵام ئەمرۆ شافیعیی وا لە تاقییکارییەکی یەکجار سەختدا .. ئاشکراکردنی را و بۆچوونی خۆی هەروا ئاسان نەبوو .. پشت هەڵ کردن لە بۆچوونی کەم و کورتی هەڵگرانی فەرموودە و لە بۆچوونی دوور لە سوننەتی ئەهلی ( رأي ) و ، بڕیاردانی قوتابخانەیەکی سێهەم لەو ناوەندەدا هەروا شتێکی ئاسان نەبوو ..

شوێن‌کەوتنی سوننەت بە رێکێ و پێکیی و ، کەڵکێ وەرگرتنیش لە تاقیی‌کاریی ئەهلی ( رأي ) و ، پاشان پێکئهێنـــانی قوتابخانەیـــەکی بـەهێز لـە هـەردووکیان هـەروا کـارێکی سادە نەبوو .. بەڵکو کارێکی یەکجار سەخت بوو .. پێویستی بە زانستێکی یـەکجار فـراوان و ، بەڵگە و دەلیلێکی یەکجار بەهێز هەبوو ، کە لەبەر دەم کەڵەزانایانی هەردوولادا خۆی پێ رابگیرێ ..

ئەمە کارێکی یەکجار مەزن بوو ..

رزگارکردنی شەریعەت ..

رزگارکردنی فەرموودە ..

رزگارکردنی مێشکی مرۆڤ ..

رزگارکردنی هەموو ئەمانە لە دەمارگـیریی و تاقمەپەرسـتیی و مـل‌ملانێـی نـەفس و نارەزووەکان ..

ئەم کارە پیاوێکی پاڵەوانی دەویست .. پیاوێکێ کە رەورەوەی مێژوو بگۆڕێت ..

خوای گەورە بۆ ئەم کارە نوێخوازییە مەزنە ئیمام شافیعیی هەڵ بژارد .

بە راستیی شافیعیی خوا پێداو بوو ..

داخۆ خاوەنی چ پلەیەکی بەرزی ئیخلاص بوو بێ ؟

داخۆ چەندێ سەرگەرمی خواپەرستیی بوو بێ ؟

داخۆ چەند بە وردیی خۆی لە گوناهـ پاراستبێ ؟

بە راستیی شافیعیی پیاوی مەیدان بوو !!

جا مێژوونووسان گەشتەکانی شافیعیی‌یان تێکەڵ و پێکەڵ باس کردووە ، بۆیە جیـاوازیی لەوەدا هەیە کە لە بەغداد بۆتـە میوانـی کـێ ؟ هـەندێ ئـەڵێن : میوانـی ئەبوحەسـانی زیادیی بووە و ، هەندێکیش ئـەڵێن : میوانـی زەعفـەرانیی بـووە و ، هـەندێکیش ئـەڵێن : میوانی بیشری مورییسیی بووە ، کـە لەبـەر رێـز لێ‌گرتـن شـافیعیی لـە نـهۆمی سـەرەوەدا داناوە و ، خۆیشی لە خوارەوە . تا ئەوە بوو دایکی شافیعیی بـە شـافیعیی ئـەڵێت : ئـەبو عەبدوڵلا ! لای ئەم زیندیقەدا چیی دەکەی ؟ ئیتر ئەویش دەگوێزێتــەوە بـۆ شـوێنێکی‌تر[٦٢] . ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بیشر خاوەنی بیروباوەڕی موعتـەزیلە بووە و بڕواشی بە ( إرجـاء ) بووە و ، لەسەر رای ( الجهمية ) ش بووە .

[٦٢] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .

كە شـافیعیی گەیشتە بەغداد ، رووی لـە مزگـەوتی ( الغـربي ) كـرد ، كـە چـەندین ئـەڵقـەی دەرسـی تێدا بوو .. لە گۆشەیەكەوە دەستی دایە بڵاوكردنەوەی ئـەو ( أصـول ) و ( قواعد ) و ( فقهـ) ەی كە پێیان گەیشتبوو .. بەرە بەرە چ قوتابیان و چ زانایان روویـان كـردە دەرسـەكەی .. یەكـەم جـار بەشـی زۆریـان بـۆ تاقیی‌كردنـەوەی دەهـاتن .. بگـرە هـەندێكیان زۆر بـە خۆیـان و بۆچوونەكـەیاندا دەنـازیی و ، بـە لووتـی بـەرزەوە بـۆ ئـەوە هاتبوون تا گاڵتە بـەم فیقهـ زانـە تازەیـە بكـەن .. بـەڵام كـە گوێیـان لێـی دەگـرت بـەنج دەبوون.. خۆیان پێ‌نەدەگیرا و تەسلیم دەبوون .. كە لەوانە ئەبوثـەور و ، حوسـەینی كـوڕی عـەلیی كەرابیسیی بوون ..

ئەبوثـەور ئـەڵێت : « كـە شـافیعیی گەیشتە عـیراق ، حوسـەینی كـوڕی عـەلیی كـەرابیسـیی ـ كە هاتوچۆی ئەهلی ( رأي ) دەكـرد ـ هاتـە لام و پێمـی وت : پیـاوێك لـە هەڵگرانی حەدیث هاتووە و خۆی بە فەقیهـ لە قەڵەم دەدا ، هەستە با بچـین گاڵتـەی پـێ بكـەین .. كـە چووین بـۆ لای ، حوسەین پرسـیارێكی لێ كـرد .. ئـەوەندەی وت : خـوا فەرموویە .. پێغەمبەری خوا فەرموویە هەتا لە ژوورەكەدا هیچمـان نـەدەبینی . ئـەوە بـوو وازمان لە بیرو بۆچوونی خۆمان هێنا و كەوتینە شوێن ئەو »[٦٣] .

لە ریوایەتێكی تردا ئەبوثەور ئەڵێت :

« یەكێ لە هـاوەڵانی موحەممـەدی كـوڕی حەسـەن بـووم .كـاتێك كـە شـافیعیی هاتـە ناومان ، بە وێنەی گاڵتەكەرەوە هاتمە كۆڕەكەیەوە و لـە بـارەی ( الـدور )ەوە پرسـیارێكم لێ كرد . كەچیی وەڵامی نەدامەوە ، بەڵكو پرسیاری لێ كردم : لـە نوێـژدا دەسـتت چۆن بەرز دەكەیتەوە ؟ وتم : بەم شێوەیە . فەرمووی : دەی هەڵەت كرد ! وتم : ئەی چۆن بكەم؟ فەرمووی : ئیبن عویەینە لە زوهەرییەوە ، لە سالمەوە ، لە باوكیەوە بـۆی گێڕامـەوە كـە پێغەمبەر ﷺ هەردوو لەپە دەستی تـا ئاستی هەردووشانی بـەرز دەكردنـەوە .. هـەروەها كاتێ كە بە روكووعدا دەچوو و ، كاتێكیش كە لە روكووع سەری بەرز دەكردەوە .

ئەبوثەور ئەڵێ : ئەمە چووە دڵمەوە و ، زیـاتر هـاتوچۆی لای شـافیعییم دەكـرد و ، بـۆ لای موحەممەدی كوڕی حەسەنیش كەمتر . تا ئەوە بوو رۆژێكیان موحەممەد پێمـی وت : ئەبو ثەور ! وا ئەزانم ئـەو حیجازییـە كـاری كردۆتـە سـەرت . ئـەڵێت : وتم : بـەڵێ ، ئـەو ڕاست دەكات . وتی : چـۆن ؟ ئـەڵێت : وتم : لـە نوێـژدا دەسـتت چۆن بـەرز دەكەیتـەوە ؟

---

[٦٣] توالي التأسيس ( ٥٨ ) .

ئەویش وەکۆ ئەوەی کە من وەڵامی شافیعییم دایەوە وەڵامی دامــەوە . وتم : دەی هەڵـەت کرد ! وتی : ئەی چۆن بکەم ؟ وتم : شافیعیی لە ئیبن عویەینــەوە ، لـە زوهەری‌یـەوە ، لـە سالمەوە ، لە باوکیەوە بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبـەر ﷺ هـەردوو لەپـە دەسـتی تـا ئاسـتی هەردوو شانی بەرز دەکردنەوە .. هەروەها کاتێ کە بە روکووعدا دەچـوو و ، کـاتێکیش کـە لە روکووع سەری بەرز دەکردەوە .

ئەبوئەور ئەڵێ : دوای مانگێکۆ شافیعیی فەرمووی : ئەبو ئــەور ! وەڵامـی پرسـیارەکەت دەربارەی ( الدور ) وەربگرە ، ئەو رۆژە تۆ ملە جەڕەت دەکرد بۆیە وەڵامم نەدایتەوە » .[٦٤]

ئەبوئــەور ئـەڵێت : « مـن و ئیسـحاقی کـوڕی راهوویـە و حوسـەینی کەرابیســیی و ، کۆمەڵێکۆ عیراقیی تا چاومان بە شافیعیی نەکەوت وازمان لە بیدعـەکانمان نەهێنا » ..[٦٥]

ئیمام شافیعیی هەروا خەریکی دەرخستنی تێگەیشتنی ناوازەی قورئان و سوننەت بوو ، هەتـا هـەمـوان دانیـان بە زانستی رێـکۆ و پێکی‌دا نا و ، ئەڵقە نەیـارەکـانی مـزگـەوتـــی ( الغـوبي ) ـ کـەمێکیان نـەبێ ـ هەرهـەموو هـەڵگیران . لـە هـەمان کـاتدا لـەوەو پێـش شارەزایانی فـەرموودە زۆر بـە سـادەیی لـە فـەرموودەکان دەگەیشتن لەبـەر ئـەوە ئـەهلی (رأي ) هەموو دەسەڵاتێکیان لێ سەندبوون ، بەڵام کە شافیعیی هاتـە بـەغداد فیقـهێکی نوێی پێشکەش کرد ، کە قورئان و فەرموودە پشتگیری بوون ..

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەفەرموێ : « **كانت أقضيتنا في أيدي أصحاب أبي حنيفة ما تنــزع ، حتى رأينا الشافعي ، فكان أفقه الناس في كتاب الله وفي سنة رسول الله** » .[٦٦]

هەتـا هەڵگرانی فـەرموودە لە عیراقدا ئەوەندە دەستە پاچەبوون خۆیان فێری زانســتی ( أهل الرأي ) ئەکرد تا شارەزای فیقهـ ببن . ئەوە بوو ئیمام ئەحمەدی کـوڕی حەنبـەل ، کاتێ کە لە بارەی ئیمام شافیعی‌یەوە پرسیاری لێ‌کرا ، دەی‌فەرموو :

« خوای گەورە بە شـافیعیی خـەڵاتی کردین . ئەوە بوو خۆمـان فێری قسـەی خەڵکەکـە ( واتە أهل الـــرأي ) دەکرد و ، کتێبەکانیشمان دەنووسـینەوە ، هـەتا شـافیعیی هاتـە ناومان . کاتێ کە قسەکانی ئەومان بیست زانیمان کە لە هەموان زاناترە ، بۆیـە ئێمـەش

---

[٦٤] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣٠٢ ) .
[٦٥] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦١ ) .
[٦٦] توالي التأسيس (٥٦ ) .

شەوان و ڕۆژێکی زۆر لە خزمەتیا دانیشتین و جگە لـە خێر و چاکـە هیچی ترمـان پێـوە نەبینی ، ڕەحمەتی خوای لێ بێ .[٦٧]

پێش شافیعیی هەموو خەمێکی فەرموودەناسـان ئـەوە بـوو فـەرموودەی جۆرا و جۆر کۆبکەنەوە ، بێ ئەوەی لە مانا و مەبەستیان تێ بگەن ..

ئیبن جەوزیی لـە خەططابی‌یـەوە ریوایـەتی کـردووە کـە وتوویـە : یـەکێک لـە مامۆستایانمان ئەم فەرموودەیەی ریوایەت دەکرد کە پێغەمبەر ﷺ ( نهی عن الحلق قبل الصلاة یوم الجمعة ، بإسکان اللام ) ئەڵێ : هەواڵیشـی دامـێ کـە بـۆ مـاوەی چل سـاڵ پێش نوێژی جومعە سەری نەتاشیوە . ئەڵێ : منیش پێم وت : ( حَلْق ) کۆی ( حَلْقَة ) یە و ، بە لایەوە مەکرووهـ بـووە پێـش نوێـژ بـۆ زانسـت و دەرس‌خوێنـدن ئەڵقـە ببەسـتن و ، فەرمانی داوە خەریکی نوێژی جومعە بن و گوێ لـە وتارەکـە بگـیرێ . وتـی : بـە راستیی رزگارت کردم . پیاوێکی صاڵحیش بوو .[٦٨]

لەگـەڵ ئـەوەش‌دا هـەندێ لـە زانایـانی فـەرموودە گەیشـتبوونە چڵەپۆپـەی هونـەری فەرموودەناسیی و ، لە فیقـهی فـەرموودە دەگەیشـتن ، وەک یـەحیای کـوڕی موعـین و ، ئیبـن مـەدینیی و ، بوخـاریی و موسـلیم و لـە سـەرووی هەمووشیانەوە ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەل . بەڵام لە فیقهـ دا تـەواو لێ‌هـاتوو نـەبوون . جـا کـە شـافیعیی هاتـە ناویـان کـە پیاوێکی قورەیشیی خاوەن ژیریی و سەلیقە بوو و ، نیوەی عـەقڵی دنیـای بـەلاوە بـوو و ، هەموو قورئانی لەبەر بـوو و ، شارەزای سـوننەتی شـەریف بـوو ، کـە لـە گـەورە پیـاوانی فەرموودەوە ، وەک سوفیانی کوڕی عویەینە و مالیکی کوڕی ئەنـەس ، وەری گرتبـوو و ، هیچ کەس بە رادەی تێ‌گەیشتنی ئەو شارەزایی نەبوو ، بە ئـاوات گەیشـتن .. بـە تایبـەت کە شافیعیی خاوەنی ڕەوشتی بەرز و ، تەقوا و وەرەع و ، خاوەنی حیلـم و ویـژدان و ئـارام بوو و ، مەردانە و پاڵەوانانە دانی بە راستیی‌دا دەنا و وەری دەگرت ، ئـەوانیش بـە وێنـەی پەپوولەی شـەیدای ڕووناکیی دەوریـان لـە شـافیعیی دا و زانسـتی قورئانیـان بـە هـەموو بەشـەکانیەوە لێ وەرگـرت و ، لـە زانسـتی فـەرموودەش‌دا شـارەزایی‌یەکی چاکیـان لێ وەرگرت ..

---

[٦٧] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٠ ) .

[٦٨] تلبيس إبليس ( ١١٤ ) .

لەم ماوەیەدا خەڵکێکی زۆر لە شارەزایانی فەرمووده شاهێدییان دەدا کە شافیعیی بە راستیی شارەزای ئیسلامە .

حەسەنی کوڕی موحەممەدی زەعفەرانیی ئەڵێت : « هەڵگرانی فەرمووده خەوتبوون ، شافیعیی هات و بەخەبەری کردنەوە و ، ئەوانیش بەخەبەر هاتن » .[٦٩]

داوودی کوڕی عەلیی ظاهرییش[٧٠] شافیعیی بە چرا ناو دەبات بۆ خزمەتی فەرمووده و ، هەموو روون کردنەوەیەکیشی بە بەڵگە دەژمێرێ کە ئەڵێت : ( كان الشافعي رضي الله عنه سراجاً لحملة الآثار ، ونقلة الأخبار ، ومن تعلق بشيء من بيانه صار محجاجاً ).[٧١]

ئیمام ئەحمەد فەرموویە : « ئێمەش و ئەهلی ( رأي )ش خەریك بووین لەعنەتمان لە یەکتریی دەکرد ، هەتا شافیعیی هات و تێکەڵی کردین » .[٧٢]

دوویەیس[٧٣] ئەڵێت : « لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە مزگەوتدا بووین ، حوسەین ـ واتە کەرابیسیی ـ تێپەڕیی و وتی : ئەمە ـ مەبەستی لە شافیعیی دەبێت ـ رەحمەتی خوایە بۆ ئوممەتی موحەممەد »[٧٤] هەروەها وتوویە :

« شافیعیی فێری کردین ئەوسا لە فیقهی زۆربەی سوننەتەکان تێگەیشتین » .[٧٥]

هیلالی کوڕی عەلائیش وتوویە : هەڵگرانی فەرمووده قەرزاری شافیعیین ، چونکە ئەو دەرگای بۆ خستنە سەر پشت »[٧٦]

بەڵام ئیمام ئەحمەد فەرمایشتی زۆری هەن دەربارەی کاریگەری ئیمام شافیعیی لەسەر فەرمووده ناسەکان ، کە یەکێ لەوانە : « ئەگەر شافیعیی نەبوایە فیقهی فەرموودەمان نەدەزانی » ..[٧٧] هەروەها فەرموویە : « هەڵگرانی فەرمووده مانای فەرموودەی پێغەمبەری خوایان ﷺ نەدەزانیی ، ئەو بۆی روون کردنەوە »..[٧٨] هەروەها فەرموویە :

---

[٦٩] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٠ ) .

[٧٠] یەکێکە لە ئیمامانی ئیجتیهاد لە ئیسلامدا و ، ئیمامی ئەهلی ظاهیر بووە . ساڵی ( ٢٧٠ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[٧١] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٣ ) .

[٧٢] ترتيب المدارك ( ١ : ٩٥ ) .

[٧٣] ئەبوعەلیی دویەیس کوڕی سەلامی قەصبانیی کە ساڵی ( ٢٠١ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[٧٤] آداب الشافعي ( ٧٥ ) .

[٧٥] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦١ ) .

[٧٦] تهذيب الأسماء ( ١ : ٦٤ ) .

[٧٧] توالي التأسيس ( ٥٧ ) .

[٧٨] تهذيب الأسماء ( ١ : ٦١ ) .

« فیقهـ لـه رووی فەقیهـەکاندا داخرابـوو ، خـوا بـه هـۆی شـافیعیی‌یەوە کردیـەوە »[79] .

هەروەها فەرموویە : « هەڵگری فەرموودە لە کتێبی شافیعیی تێر ناخوات »[80] .

لە صاڵحی کوڕی ئەحمەدی کـوڕی حەنبەلـەوە ئەگێڕنـەوە وتوویـە : « ڕۆژێکیـان بـاوکم نەخۆش بوو و ، شافیعیی بۆ سەردانی هاتە لای . باوکم هەڵمەتی دا و چوو بە دەمیەوە و ، ناوچاوی ماچ کـرد ، پاشـان لـە شـوێنەکەی خـۆیدا دای‌نیشـاند و خۆیشـی لەبەردەستی‌دا دانیشت .. ئـەڵێ : بـۆ مـاوەی سـەعاتێک پرسـیاری لێ دەکـرد .. کـە شـافیعیی هەسـتا و ویستی سوار بێـت و بڕوا ، بـاوکم هەسـتایەوە و ئاوزەنگی‌یەکـەی بـۆ گـرت و ، لـە گـەڵیا ڕۆیشـت .. ئـەو هەواڵـە بـە یـەحیای کـوڕی موعـین گـەیشـت و ، جوابـی بـۆ بـاوکم نـارد : ئەبوعـەبدوڵلا ! پـاک و بێ‌گـەردیی بـۆ خـوا ! ئایـا ئـەوەندە ناچـار بوویـت لـە تەنیشـت ئێسترەکەی شافیعی‌یەوە بچیت بە ڕێوە ؟ باوکیشم وەڵامی دایەوە : ئەبوزەکەریا ! ئەگـەر تۆیش لەلاکەی تریەوە بچوویتایە بەڕێوە کەڵکت وەردەگـرت . ئـەڵێت : پاشـان بـاوکم پێـی وت : هەرکەسێ فیقهی بوێ با بۆنی کلکی ئەو ئێسترە بکات »[81]

با گوێ لە ئیمام ئەوەوییش بگرین کە باسی دەوری گرنگی ئیمـام شـافیعیی دەکـات بـۆ وریاکردنەوە و ڕاستکردنەوەی زانایانی فەرموودە کە ئەڵێت :

« وهو الذي قلد المنن الجسيمة أهل الآثار ، وحملة الحديث ، ونقلة الأخبار ، بتوقيفه إياهم على معاني السنن ، وتبيينه ، وقذفه بالحق على باطل مخالفي السنن وتمويههم ، فنعشهم بعد أن كانوا خاملين ، وظهرت كلمته على جميع المخالفين ، ودمغهم بواضحات البراهين ، حتى ظلت أعناقهم لها خاضعين »[82] .

هەروەها لـە بـارەی متمانـەکردن بـە زانسـتی شـافیعی‌یەوە ئیمـام ئەحمـەد ئەفـەرموێت : « ئەگەر لە بارەی مەسەلەیەکەوە پرسیارم لێ بکرابایە و هیـچ بەڵگەیـەکم پێ نەبوایە ، بە فەرمایشتی شافیعیی وەڵامم دەدایەوە ، چونکە ئەو زانای قوڕەیشە »[83] .

---

[79] تهذيب الأسماء ( ١ : ٦١ ) .

[80] تهذيب الأسماء ( ١ : ٦١ ).

[81] معجم الأدباء ( ٧١ : ٣٠١ ) .

[82] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٠ ) .

[83] طبقات الشافعية ( ١ : ٢٠٠ ) .

ئیتر فەرموودەکەی [٨٤] گێڕایەوە و ، تەئویلی وەها کرد کە شافیعیی دەگرێتەوە . واتە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو زانایە ئیمام شافیعی‌یە . بە هەمان شێوەی ئیمام ئەحمەد مامۆستا نوورسییش لە ( مەکتووبات ) دا ل ١٣٧ دەری بڕیوە کە ئەو فەرموودەیە مەبەستی ئیمام شافیعی‌یە .

کورتەکەی : کەڵە زانایانی عیراق لە زانستی بەرزی شافیعیی ئاگادار بوون و ، خۆیان کردە قوتابیی ئەو پاڵەوانە و ، لە قووڵایی دڵیاندا جێیان کردەوە ..

بوەیطی ، کە یەکێکە لە قوتابی‌یەکانی شافیعیی لە میصردا ، ئەڵێت :

« قەدری شافیعییمان نەزانیی هەتا دانیشتوانی عیراقم بینی چۆن ناوی دەبەن و ، بە شێوەیەک وەسفی دەکەن کە ئێمە نیوەی ئەو وەسفە نازانین بی‌کەین .. زۆر شارەزایانی عیراق لە فیقهـ و ئیجتیهاددا ، بگرە هەموو چینێک لە ئەهلی فەرموودە و زمانی عەرەبیی و ، موجتەهیدان ، هەر هەموو دەیان وت کە : پیاوی وەک شافیعی‌یان نەدیوە)) . [٨٥]

لە گەشتی دووهەمی بەغداددا ، ئیمام شافیعیی کەڵکێکی زۆری بە عیراق گەیاند ، چونکە دانیشتوانی بەغداد لەو سەردەمەدا ، لە کۆتایی صەدەی دووهەمی کۆچیی‌دا ، لە چەندین کۆمەڵ و مەزهەب پێک هاتبوو .. بیروباوەڕ و فەلسەفە و زانست و بۆچوونێکی یەکجار زۆری تێدا بوو .. ماڵ و سامان و دەسەلات هەندێکی سەرگەرمی ژیانی کردبوو .. مزگەوتەکانیش لە خواناسان و زاهیدان و تەقواداران پڕبوون کە دەستە دەستە خۆیان لە زانستە شەرعی‌یەکان شارەزا دەکرد .. دەستەیەک خزمەتی قورئان و .. دەستەیەک فەرموودە و .. دەستەیەک فیقهـ و .. هتد . بەمە هەزاران شارەزای بلیمەت لە هەموو بوارێکدا هەڵکەوتن .. شارستانی‌یەتێکی یەکجار مەزن بەرپا بوو و ، موسڵمانەکان سەلماندیان کە سەرداری سەرزەویین ..

---

[٨٤] فەرموودەکە فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ : (( لا تؤموا قریشاً ، وائتموا بها ، ولا تقدّموا علی قریش وقدموها ، ولا تعلموا قریشاً وتعلموا منها ، فإن إمامة الأمین من قریش تعدل إمامة الأمین من غیرهم ، وإن علم عالم قریش لیسع طباق الأرض )) . دەفەرموێ : ئیمامەت بۆ قوڕەیشیی مەکەن ، بەڵکو بیانکەنە ئیمام .. پێش قوڕەیشیی مەکەون ، بەڵکو پێشیان بخەن .. قوڕەیشیی فێری زانست مەکەن ، بەڵکو زانستیان لێوە فێر ببن .. چونکە ئیمامەتی پیاوی ئەمینی قوڕەیشیی سەنگین ترە لە ئیمامەتی پیاوی ئەمینی غەیری ئەوان و ، زانستی زانای قوڕەیشیش پڕ بە پڕی چینەکانی زەویی دەبێت .

[٨٥] تهذیب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٢ ) .

ئا لەم کاتەدا شافیعیی دەستی دایە کار .. دەستی دایە ئاڵ و گۆڕ و دەربڕینــی بۆچوونـە ناوازەکەی .. ڕێکـ و پێکیی هەردوو قوتابخانەکەی کۆکردەوە و مەزهەبێکی ڕێکـ و پێکی لێ پێکـ هێنـا .. یەکـەم جار پشـتی بـە ( دەق ـ نـص ) بەسـت .. قورئـان و فـەرموودەی دەکردنە بەڵگە .. تا ئەوان ئامادەبوونانە گوێی بە شتی تـر نـەدەدا .. بایـەخێکی چـاکی بـە (أصول ) دا بۆ ئیجتیهاد ، ئەویش بە نووسینی ( الرسالة ) کە بۆ عەبدوڕڕەحمانی کـوڕی مـەهدیی نـارد .. کـە بڵاوبوویـەوە زانایـــان لــە دەوری جـەمیان خـوارد و دەسـتیان بـە لێکۆڵینەوەی کرد و لە خزمەتی ئیمامدا دەستیان کرد بە خوێندنی ..

بەڵام باس و بەڵگەی ( فروع ) بۆ وەڵامدانــەوەی ئەوانـەی کـە بەرامبـەری دەوەسـتان ، هەموو ئەوانەی لە کتێبی ( الحجـــة ) یـــان وەکـ ئیـبن نـەدیم نـاوی نـا ( المبســـوط ) دا کۆکردنەوە ، کە یەکـ بەرگی گەورە بووە و لە عیراقدا نووسیویەتی و ، مەزهەب و قـەولـی قەدیمی شافیعیی بـەم کتیبـە دەوتـرێ کـە چـوار لـە هاوەڵـە گـەورەکانی عـیراقی لێیـەوە ریوایـەتی دەکـەن کـە : ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل و ، ئـەبو ثــــەور و ، زەعفــەرانیی و ، کەرابیسیین.

زیاد لەوەش ئیمام ئەحمەد شتی تری زۆری لە ئیمام شافیعیـیەوە ریوایەت کردووە ، کـە یەکێ لەوانە « موطأ » ی ئیمام مالیکـ بووە. تەوەتا صالیحی کوڕی ئیمام ئەحمەد ئەڵێت : گوێم لە باوکم بووە دەی فەرموو ( سمعت الموطأ من الشافعي , لأنني رأيته فيه ثبتاً ) .[٨٦]

هـەروەها ئیمـام ئەحمـەد ئەفـەرموێ : « هەرکەسـێ قەڵـەم و دەواتێکـی بـە دەسـتەوە گرتبێ ئەوا منەتباری شافیعیـیە » .[٨٧]

هەروەها فەرموویـە : « پـێ نـازانم هیـچ کەسـێکـ ئـەوەندەی شـافیعیی لـە سـەردەمی خۆیدا ئیسلامی منەتبار کردبێ » .[٨٨]

هەتا ئیمام ئەحمەد دەری بڕیوە کە ماوەی چل ساڵ لە خوای گەورە بۆ ئیمام شـافیعیی پاڕاوەتەوە..[٨٩]

---

[٨٦] توالي التأسيس ( ٥٧ ) .
[٨٧] توالي التأسيس ( ٥٧ ) .
[٨٨] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٠ ) .
[٨٩] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ ٦٠ ) .

وا ئیمام ئەحمەد پایەی تەواو بە ئیمام شافیعیی مامۆستای دەدا و ، دەری دەبـڕیٚ کـە پێویـستیی شـافیعیی بـۆ ئـەم ئیسـلامە وەکُ پێویسـتبوونی خـۆر بـۆ ئـەم دنیایـە و ، تەندروستیی بۆ لاشە وەهایە .

عەبدوڵلای کوڕی ئیمام ئەحمـەد ئـەڵێت : بـە بـاوکمم وت : بابـەگیان ! شـافیعیی چۆن پیـاوێکُ بـوو ؟ دوعـای زۆرم لیٚ بیسـتووی کـە بـۆت کـردووە. فـەرمووی : « کوڕەکـەم ! شافیعیی وەکُ خۆر بۆ دنیا و ، تەندروستیی بۆ لاشە وەهایە . جا سـەیر بکـە ، بزانـە شتیٚ تر هەیە جێی ئەم دوانە پڕ بکاتەوە ؟ » .[٩٠]

هەندیٚ لە کەڵە زانایان وای دادەنێن کە ئیمام ئەحمەد مەزهەبی سەربەخۆی نیە دوای مەزهەبی شافیعیی ، بەڵکو چەند ئیجتیهادێکە و بەس ، ئیتر هەر لە سەر مەزهەبی ئیمام شافیعیی بووە .

لە کتێبی حاکمدا هاتووە : گوێم لە ئەبوبەکر موحەممەدی کوڕی عـەلیی کـوڕی ئیسـماعیلی فەقیهـ ، ئیمامی چەرخی خۆی و ناوچەی ( ما وراء النهر ) بـووە کـە دەیوت: یەکـەم جار کـە گەیشتمە نەیساپوور چوومە لای ئەبوبـەکر موحەممـەدی کـوڕی ئیسـحاقی کـوڕی خوزەیمـە و ، منیش گەنجێکی تازە هەڵکەوتوو بووم و دەستم بە قسە کـرد لەبـەر دەمـیدا . لێمـی پرسـیی : هات و چۆی کێت کردووە ؟ وتم : بۆ لای ( ابو الليـــث ) . وتـی : ئـەم ئەبوللەیشـە لەسـەر چ مەزهەبێکە ؟ وتم : حەنبەلییە . وتی : کوڕەکەم ! بلیٚ : شافیعییە . جا بۆچ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل منالێکُ لە منالەکانی شافیعیی زیاتر بووە ؟![٩١]

زەعفەرانییش ئەڵێت : « هەرچیی چووبمە مەجلیسی شـافیعییەوە ، ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەلم لەویٚ بینیوە » .[٩٢]

ئیمام شافیعیی لە عیراقدا قوتابییەکی زۆری پیٚگەیاند ، کە ئەمانە ناودارەکانیـانن : ئەحمەدی کوڕی خالیدی خەللال و ، ئەحمەدی کوڕی سینانی قەططان و ، ئەحمەدی کوڕی سورەیجی نەهشـەلیی و ، ئەحمـەدی کوڕی حەنبـەل و ، ئەحمـەدی کـوڕی یـەحیای کـوڕی عەبدولعەزیزی بەغدادیی و ، ئیسحاقی کوڕی راهویە و ، حاریثی کوڕی سورەیجی نەققال و ، حەسـەنی کـوڕی موحەممـەدی صـەباحی زەعفـەرانیی و ، حوسـەینی کـوڕی عـەلیی

---

[٩٠] صفة الصفوة : ( ٢ : ١٤٢ ) .

[٩١] معجم الأدباء ( ١٧ : ٢٩٨ ) .

[٩٢] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٠ ) .

کەرابیسیی و ، حوسەینی قەللاس و ، سولەیمانی کوڕی داوود و ، قاسمی کـوڕی سـەلامی ئەبوعوبەید . بەڵام ئەم چوارەی خوارەوە لە هەموویان تێگەیشتووتر و بەخزمەت‌تر بوون :

**یەکەمیان : ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل :** کـە یەکێکـە لـە چـوار ئیمامـە مەزنەکـەی ئەهلی سوننە . شافیعیی دەربارەی دەفەرموێ : « کـە لـە بـەغداد گەڕامـەوە ، کەسـم تیـا بـەجێ نەهێشـت کـە لـە ئەحمـەد فەقیهـ تـر و واریـــعتـر و زاهیدتـر و زانـاتر بێـت » . ئەبوزەرعـەش دەری بڕیـوە کـە ئیمـام ئـەحمد یـەکێ ملیـۆن فـەرموودەی لەبـەر بـووە .. ئیبراهیمی حـەربییش وتوویـە : بـە شێوەیەکێ ئەحمـەدم دیـوە هـەروەکێ خـوا زانسـتی هەرهەموانی بۆ کۆ کردبێتەوە .

قوتەیبـەش وتوویـە : هەرکەسـت دیـی ئەحمـەدی خـۆش دەویسـت ، بزانـە کـە ئـەوە شوێنکەوتووی سوننەتە .

ئەوەبوو لای ئیمام شافیعیی شـارەزای شـەرع بـوو و ، لەسـەر مەسـەلەی خـەلقی قورئـان بـۆ ماوەی بیست و هەشت مانگێ خەلیفە موعتەصەم بەندی کرد . بـەڵام کـە موتـەوەککیل کـاری گرتە دەست ڕێزی لە ئیمام ئەحمەد گرت . ساڵی ٢٤١ ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

**دووهەمیان : ئیبراهیمی کوڕی خالید ، ئەبوثەور :**

لە سوفیانی کوڕی عویەینە و ، ئیبن ( علية ) و ، شافیعیی و ، عەبدوڕڕەحمانی کـوڕی مـەهدیی و ، یـەزیدی کـوڕی هاروونـەوە فـەرموودەی ریوایـــەت کـردووە . . موسـلیم و ، ئەبوداوود و ، ئیبن ماجە و ، بەغەویی فـەرموودەیان لێـوە ریوایـەت کـردووە .. دەربـارەی ئەبوثەور پرسیار لـە ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل کـرا : دەربـارەی ئەبوثـەور چیـی ئـەڵێی ؟ فەرمووی : پەنجا ساڵە بە شوێنکەوتووی سوننەتی دەزانم و ، بە لای منیشـەوە هاوشـانی سوفیانی ثەوریـیە .

ئیبن حەببانیش دەربارەی ئەڵێت : لە بارەی فیقهـ و زانست و وەرەع و فـەزڵ و چاکـەوە یەکێ لە ئیمامانی دنیا بوو .. ساڵی ٢٣٧ ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە ..[٩٣]

**سێهەمیان : حەسەنی کوڕی موحەممەدی زەعفەرانیی :**

ئیمـامێکی مـەزن و ، فەقیهـــ و ، فـەرموودەناس و ، زمـانپـاراو و ، ڕەوانبێـژ و ، متمانەپێکراو و ، دامەزراو بووە ..

[٩٣] بە کورتە لە طبقات الشافعية ( ٢ : ٧٤ ) وەرگیراوە ..

لــه ســوفیانی کــوڕی عویەینــه و ، شــافیعیی و ، عویــەیدەی کــوڕی حــەمید و ، عەبدولوەهھابی ثەقەفیی و ، یەزیدی کوڕی هاروون و هی تریشـەوە فـەرموودەی ریوایـەت کـردووه و ، بوخاریی و ، ئـەبوداوود و ، تـــیرمیذیی و ، نەسســائیی و ، ئیـبن ماجــەش فەرموودەیان لێیەوه ریوایەت کردووه .

له رەمەزانی ساڵی ( ٢٦٠ ) ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووه .

**چوارەمیان : حوسەینی کوڕی عەلیی کوڕی یەزیدی کەرابیسیی :**

ئیمامێکی مەزن بووه که شارەزایی‌یەکی چاکی له فیقـه و فـەرموودەدا بـووه ، سـەرەتا له لای ئەهلی ( الـرأي ) فیقـهی وەرگرتـووه ، پاشـان لای شـافیعیی فیقـهی وەرگرتـووه و فەرموودەشی لێ بیستووه . هەروەها فەرموودەی لـه یـەزیدی کـوڕی هـاروون و ئیسـحاقی ئەزرەق بیستووه ..

کەرابیسیی یەکێ بووه له زانایانی ( علم الكلام ) ی ئەهلی سوننه و ، مامۆستایەکی پایەداری فەرمووده و فیقهیش بووه . ساڵی ( ٢٨٤ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووه .

شایانی باسه دوان لەم چوار قوتابی‌یـه نـاودارەی ئیمـام شـافیعیی کـه ئیمـام ئەحمـەد و ئەبوثەورن گەیشتوونەته پلەی ئیجتیهادی موطلەق [٩٤] .

بەڵێ ، له گەشتی دووهەمدا ئیمام شـافیعیی نزیکـەی دوو سـاڵ لـه بـەغداد مایـەوه تـا مەزهەبەکەی بڵاوکردەوه و ، چەند قوتابیی پایەداری پێگەیاند ، که مەردانـه زانسـتەکەی بڵاوبکەنەوه و ، شێرانه بەرگریی لێ بکەن .

دوای ئەوه گەڕایەوه مەککه و ، لەوێش مژدەی بڵاوبوونەوەی مەزهەبەکەی به قوتابیان دا و ، ( أصول ) و ( قواعد ) ی زانسته ناوازەکەی راگەیاند . بەڵام له مەککەدا زۆر خۆی بۆ نەگیرا و ، تاسەمەندیی بەغداد کەمەندکێشی کردەوه .

ئەوەبوو له ساڵی ١٩٨ یان ١٩٩ ی کۆچییدا گەڕایەوه بەغداد و چەند مانگێک تیایدا مایەوه و ، دوای ئەوه گەڕایەوه مەککه و ، پاشان بەرەو میصر کەوته رێ .. [٩٥]

سـەردانی سـێهەمی بـۆ بـەغداد بەسـەرکردنەوەی قوتابخانەکـەی بـوو ، تـا لـه حـاڵ و ئەحواڵی قوتابی‌یەکانی ئاگاداربێ .

لەم گەشتەی سێهەمیدا حوسەینی کوڕی عەلیی کەرابیسیی قوتـابیی ئیمـام شـافیعیی ویسـتی کتێبـەکانی ئیمـام بخوێنێتـەوه بـۆی . بـەڵام ئیمـــام مـــاوەی نـــەدا و فـــەرمووی: کتێبەکانی زەعفەرانیی وەربگره ، وا رەزامەندییم بۆت دەربڕیی ..

[٩٤] الإمام الشافعي ، فقيه السنة الأكبر ( ١٤٦ ) .

[٩٥] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .



# گەشتی وڵاتی میصر

ئیمام شافیعیی دوای سێهەم گەشتی بەغداد گەڕایەوە مەککە و ، ماوەیەکی کە تیای‌دا مایەوە ، تا خوای گەورە هەلی بۆ ڕەخساند و بەرەو میصر کەوتە ڕێ .

هۆی ئەم گەشتەش ئەوەبوو کە عەبباسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی کوڕی مووسای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس - کە جێگری باوکی بوو بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری وڵاتی میصر - داوای لە ئیمام شافیعیی کرد لەگەڵیا بچێت بۆ میصر ئیمامیش کەوتە گەلی و ئەمەش لە ساڵی ١٩٩ ی کۆچیی‌دا بوو .

لە سەرەتاوە بووە میوانی خاڵوانی لە هۆزی ئەزد و ، وا دەردەکەوێ پاشان بووبێتە میوانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولحەکەم ، کە دۆستی ئیمام بووە و ، ڕێزێکی ناوازەی لێ‌گرتووە و ، لە سامانی خۆی هەزار دیناری زێڕی پێ‌داوە و ، لە بازرگانێکی نامۆزاشی هەزار دیناری تری بۆ وەرگرتووە و ، لە دوو پیاوی دۆستیشی هەزاری تر . پاشان هەموو کتێبەکانی ئیمامی بۆ خۆی و بۆ کوڕەکەی نووسینەوە و ، موحەممەدی کوڕیشی کردە قوتابیی ئیمام و ، هەروا بەردەوام ڕێزی دەگرت ، هەتا هەر لەوێ ئیمام شافیعیی - خوا لێی ڕازیی بێ - کۆچی دوایی کرد و هەر لەوێ لە خاکی نەوەی عەبدولحەکەم‌دا ناشتیان ..

ئەم گەشتەی ئیمام شافیعیی بۆ میصر لە گەشتەکەی عیراقی کەمتر نەبوو . ئەوە بوو وەک لە عیراق‌دا لە ( أصول ) دا ( الرسالة ) ی نووسیی و ، لە ( فروع ) یش‌دا ( الحجة )ی نووسیی ، کە گەیشتە میصریش سەر لە نوێ ( الرسالة )ی نووسییەوە ، کە ئەوەیە ئەمڕۆ بە دەست موسوڵمانانەوەیە و ، بە کتێبی ( الحجة )ش‌دا چوویەوە و لە جیاتی ئەو کتێبی ( الأم )ی دانا کە بریتی‌یە لە کۆمەڵە کتێبێکی زۆر . جا کە وترا لە قەولی ( قديم ) دا ئەوا مەبەست لە ( الحجة )یە و ، کە وترا لە قەولی ( جديد ) دا ئەوا مەبەست لە کتێبی ( الأم )ە . هەر لە میصر چەند کتێبێکی تری نووسیی کە لەوەو بەر کەس نەی‌نووسیی بوون ، وەک نەوەویی ئەڵێت ، وەک : أصول الفقه ، كتاب القسامة ، كتاب الجزية ، كتاب قتال أهل البغي و هی تریش ..

که ئیمام شافیعیی گەیشتە میصر ، موسڵمانان شوێنکەوتەی مەزهەبی ئیمام مالیک بوون و کەمێکیش لەزانایان لەسەر مەزهەبی ئیمام ئەبوحەنیفە بوون . ئەوەندەی پێنەچوو خەڵکەکە دەورەیان لە ئیمام شافیعیی دا و ، گوێیان بۆ گرت و ، لە قوڵایی دڵەوە خۆشیان دەویست و ، شەیدای زانست و بۆچوونەکەی بوون .

هاروونی کوڕی سەعیدی ئەیلیی ئەڵێت : « پیاوی وەک شافیعییم نەدیوە .. هاتە ناومان بۆ میصر و ، وترا : پیاوێکی قوڕەیشیی هاتووە . ئێمەش هاتینە لای دەبینین خەریکی نوێژکردنە .. کەسمان نەدیبوو ئەوەندە جوان نوێژ بکات و ، ئەوەندەش ڕوومەت گەشاوە بێت .. کە دەستیشی بە قسەکردن کرد کەسمان نەدیبوو ئەوەندە شیرین گوفتار بێت .. هەموومان شەیدای بووبووین »[٩٦] .

هەروا خەریکی بڵاوکردنەوەی زانستە فراوانەکەی بوو هەتا خەڵکەکە کەوتنە شوێن فەتواکانی و هاتنە سەر مەزهەبە نوێکەی .. زانایان ڕوویان لێ نا و دەستیان بە نووسینەوەی کتێبەکانی کرد و ، ئەوانەش کە خاوەنی ئینصاف بوون لە نەیارانی شاهێدییان لەسەر زانایەتیی و تەوانایی ئیجتیهادی دا . ئەوەتا عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولحەکەم[٩٧] کە شێخی گەورەی مەزهەبی مالیکیی بوو لە میصردا دان بەوەدا دەنێ کە پیاوی نەدیوە وەک شافیعیی توانای حوکم دەرهێنانی ببێ ، کە ئەڵێت : « ما رأيت مثل الشافعي ، وما رأيت رجلاً أحسن استنباطاً منه »[٩٨] .

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولحەکەم ئەڵێت : باوکم پێمی وت : «کوڕەکەم ! دەست لەم پیاوە بەر مەدە ، کەسم نەدیوە وەک ئەم شارەزای ئوصوولی فیقھ بێت ، یان وتی : ئوصولی عیلم بێت »[٩٩] . موحەممەدیش بووە قوتابییەکی بلیمەت لە خزمەتی ئیمامدا هەتا بە چاکیی زانستی وەرگرت و دواییش ستایشێکی چاکی کرد و ، دوعای خێریشی بۆ دەکرد ،[١٠٠] هەرچەندە دوای کۆچی دوایی ئیمام شافیعیی گەڕایەوە سەر مەزهەبی ئیمام مالیک .

---

[٩٦] توالي التأسيس ( ٥٩ ) .

[٩٧] لە هاوەڵە مەزنەکانی ئیمام مالیک بووە و ، دوای کۆچی دوایی ئەشهەب سەرۆکایەتیی مەزهەبی مالیکی دراوەتە دەست . ساڵی ( ٢١٤ ) ی کۆچیی لە قاهیرەدا کۆچی دوایی کردووە .

[٩٨] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦١ ) .

[٩٩] توالي التأسيس ( ٥٦ ) .

[١٠٠] الانتقاء (٧٣ ) .

ئەوەتا لە ستایشیدا ئەڵێت : « فلانە کەس بە لای ئێمەوە فەقیه نییە ، چونکە قسەی خەڵکیی کۆدەکاتەوە و هەندێکی هەڵدەبژێری . وترا : ئەی کێ فەقیهە ؟ وتی : ئەو کەسەی کە لە قورئان و فەرموودەدا حوکمی ( أصل ) ێک دەردەهێنێ بۆ ئەوەی کەس پێشی کەوتبێ . پاشان صەد لق لەو ( أصل ) ە دەردەهێنێ . وترا : جا کێ توانای ئەوەی هەیە ؟ موحەممەد وتی : موحەممەدی کوڕی ئیدریس »[١٠١]

عەلیی کوڕی مەعبەدی میصرییش[١٠٢] ئەڵێت :

« هەتا شافیعیی نەهاتبووە ناومان فەرموودەمان نەدەناسیی »[١٠٣]

دوای ئەوە دەنگ و باسی ئیمام شافیعیی ولاتانی پڕکرد ، بۆیە لە هەموو ولاتێکەوە بۆ فێربوون و ، ریوایەتکردن و ، شارەزابوون لە کتێبەکانی موسڵمانان هاتنە خزمەتی ، وەک ئیمام نەوەویی ئەڵێت[١٠٤]

حومەیدیی ئەڵێت : « کاتێک کە شافیعیی مەککەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت بۆ میصر و ، خۆی لێمان دەرباز کرد ، ئێمەش بە دوایدا بەرەو میصر کەوتینە رێ »[١٠٥]

کاتێکیش کە موحەممەدی کوڕی موسلیم[١٠٦] پرسیاری ئەوەی لێ دەکات کە ئایا کتێبەکانی شافیعیی نووسیودتەوە ؟ ئەڵێت : نەخێر ئەفەرموێت : دەی کەمتەرخەمییت کردووە »[١٠٧]

هەروەها موحەممەدی کوڕی موسلیم پرسیار لە ئیمام ئەحمەد دەکات کە ئایا مالیک و ثەوریی[١٠٨] و ئەوزاعیی[١٠٩] کامیان بۆ شوێنکەوتن چاکترن ؟ ئەویش لە ناویاندا ئاماژەی بۆ شافیعیی کرد ، کە لە هەموویان زیاتر شارەزایە .

---

[١٠١] تهذیب الأسماء واللغات ( ١ ٦٢ ) .

[١٠٢] عەلیی کوڕی مەعبەدی کوڕی نووحی بەغدادییە ، کە لە میصر نیشتەجێ بووە . ئیمام نەسسائیی فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە . عیجلیی ئەڵێت : ثقە . ساڵی ٢٥٩ ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[١٠٣] تهذیب الأسماء واللغات ( ١ ٦٢ ) .

[١٠٤] تهذیب الأسماء واللغات ( ١ : ٤٨ ) .

[١٠٥] الإنتقاء ( ٨٩ ) .

[١٠٦] موحەممەدی کوڕی موسلیمی کوڕی عوثمان رازیی حافیظە . نەسسائیی فەرموودەی لێوە ریوایەت کردووە و بە ثقەشی داناوە . ساڵی ( ٢٧٠ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە . .

[١٠٧] تهذیب الأسماء و اللغات ( ١ ٦١ ) .

[١٠٨] سوفیانی کوڕی سەعیدی کوڕی مەسرووقی ثەورییە ، لە شارەزایی فەرموودەدا ئەمیری ئیمانداران و ، سەرداری خەڵکی سەردەمی خۆیەتی . لە کووفە لە دایک بووە و هەر لەوێش گەورە بووە . خەلیفە مەنصوور ویستی لە کاروباری حوکمدا بەشداری بکات ، کەچیی ئەو نەیکرد و نیشتەجێی مەککە و مەدینە بوو . پاشان خەلیفە مەهدیی داوای

پاشان پرسیاری لیٚ دەکاتەوە کە ئایا کتیٚبی شافیعیی ئەوانەی عیراق و ئەوانەی میصریش شویٚنکەوتنی کامیان چاکترە ؟ ئەویش وەلاٌمی دەداتەوە کە ئەوانەی میصر چاکترن . بەمە بڕیار دەدا بە هیچ شیٚوەیەک میصر بەجیٚ نەهیٚلیٚ و نەچیٚ بۆ هیچ شویٚنیٚکی تر .[110]

لەگەلٌ ئەم رووداوانە و دەور قەلٌەبالٌغەدا ئیمام شافیعیی پیٚی خۆش نەبوو لە مەزهەبی مامۆستاکەی کە ئیمام مالیک بوو لا بدات .. چونکە لە کرۆکی دلٌیدا یەکەم کەس ئیمام مالیکی بە لاوە مەزن بوو ، پاشان سوفیانی کوڕی عویەینە .. بۆیە هەموو جاریٚک دەری دەبڕیی کە مالیکی کوڕی ئەنەس مامۆستایەتی و ، زانستی لیٚ وەرگرتووە و ، هیچ کەسیش ئەوەندەی ئەو منەتباری نەکردووە . هەتا خۆی بە غولامیٚک لە غولامەکانی مالیک لە قەلٌەم دەدا ..[111]

بەلاٌم کە لە میصردا هەستی کرد وا شویٚنکەوتوانی مەزهەبی مالیکیی جگە لە مەزهەبەکەی خۆیان قەناعەت بە هیچ ناکەن ، ناچار بوو رەددی هەندیٚ رای ئەو مەزهەبە بداتەوە .

خالٌیٚکی تریش کە ناچار بوو پیٚچەوانەی ئیمام مالیک شت بلاٌو بکاتەوە ، ئەوەبوو فتیانی کوڕی ئەبوسەمح[112] دەستی دایە هیٚرش و دژایەتیی ئیمام شافیعیی ، ئەگینا ئەگەر بە دریٚژایی سالٌ پرسیاری هەر شتیٚکی لیٚ بکرایە ، کە وەلاٌمی ئەدایەوە ئەیفەرموو : ئەمە فەرمایشتی مامۆستایە ..[113] ئیمام شافیعیی خۆیشی هۆیەکی تری رەددانەوەی مەزهەبی ئیمام مالیک روون دەکاتەوە کە دەبیستیٚ کلاٌویٚکی ئیمام مالیک دەستی موسلٌمانانی ولاٌتی مەغریب کەوتووە و داوای بارانی پیٚ دەکەن . ئەمە ترسی لە دلٌدا

---

کردەوە و ئەویش خۆی حەشار دا و پاشان رۆیشت بۆ بەصرە و خۆی شاردەوە تا ئەوە بوو لەویٚ لە سالٌی ( ١٦١ ) ی کۆچییدا کۆچی دوایی کرد .

[109] عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەمری کوڕی یەحمودی ئەوزاعی‌یە ، لە هۆزی ئەوزاع . لە فیقهـ و زوهددا ئیمامی ولاٌتی شام بووە . لە شاری بەعلەبەک لە دایک بووە و ، نیشتەجیٚی بەیرووت بووە و لە سالٌی ( ١٥٧ ) ی کۆچییدا هەر لەویٚ کۆچی دوایی کردووە .

[110] آداب الشافعي ومناقبه ( ٦٠ ) .

[111] ترتيب المدارك ( ٣٨٥ ) .

[112] فتیان ناوی عەبدوڵلاٌی کوڕی ئەبوسەرحە ، لە گەورە هاوەلاٌنی ئیمام مالیک بووە کە لەگەلٌ ئیمام شافیعییدا بەرابەرکیٚی کردووە .. پەلە و هەلٌپە و قسەڕەقی‌یەکی تیٚدابووە . جا لەبەر دەمارگیریی و زیادەڕەویی ئەو لە میصردا دوژمنایەتیی کەوتە نیٚوان مەزهەبی مالیکیی و مەزهەبی شافیعیی . سالٌی ( ٢٠٥ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە.

[113] ترتيب المدارك ( ٣٨٥ ) .

دروست دەکات کە رۆژگار تێپـەڕێت و ئـەو خەڵکـە سـەریان لێ بشـێوێ و ، وەک گـاوراز عیسایان کردبووە خوا یان کوڕی خوا ، ئەوانیش سـەرگەردان بـبن و مـالیک لـە سنووری مرۆڤ دەربکەن . بۆیە هەندێ رای دەداتە دواوە تـا خـەڵکیی بزانـن مـالیکیش ئیمـامێکی موجتەهیدە کە راستیش ئەڵێ و هەڵەشی لە دەست دەردەچێ .[١١٤] هەتا ئیمام شافیعیی بـۆ ماوەی ساڵێک نوێژی ئیستیخارەی کردووە . ئەمەش بۆ دەرخستنی حەق تا دینـی خـوا بـە راستیی و پاکیی پێشکەش بە خەڵکیی بکرێت ..

مالیکیـیـەکانیش لـە بەڵگـە بـەهێزەکانی شـافیعیی دەترسـان کـە مـەزهەبەکـەی پـەرە بسێنێ و بەسەر میصردا زاڵ ببێ .. هەتا ئەشهەب[١١٥] ئەوەندە تووڕە بوو بوو لە سـەجدەدا دوعای لە ئیمام شافیعیی دەکرد و دەیوت : « خوایە ! شافیعیی بکوژیت ئـەگینا زانستی مالیک دەفەوتێ »[١١٦] . کە ئەمە بە ئیمام شافیعیی گەیشتەوە و بە چـەند دێـڕە شـیعرێک وەڵامی دایەوە کە هەموو کەسـێ هـەر دەمـرێ و ، پیـاو ئـەو پیاوەیـە بـۆ قیامـەت خـۆی ئامادە بکات ، کە هاکا هات .

بە فەرمانی خوا شافیعیی کۆچی دوایی کرد و ، لەو شتانەی کە لە دوای بـەجێ مـابوون ئەشهەب غولامێکی چێشت‌کەری کڕیـی و ، دوای هـەژدە رۆژ لـە مردنـی ئیمـام شـافیعیی ئەشهەبیش مرد .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بەڵگەکانی ئیمام ئەوەندە بەهێز بـوون بـە هیـچ کـەس وەڵام نەدەدرانەوە ، ئەمەش کاری دەکردە سەر پایەدارترین فەقیهی مەزهەبی مالیکیی .

ئـەوەندە زۆریـان بۆهـاتبوو پـەنایان بردە بـەر والیـی و داوایـان لێ کـرد شـافیعیی لـە شارەکەیان دەربکاتـ ، تا خەڵکەکـەی لـە خشـتە نـەبردووە . کاربەدەستیش ویستی دەری بکات . ئەوە بوو شافیعیی و خزمە هاشمیـیەکانی هاتنە لای والیی تا واز بێنـێ ، کـەچیی کۆڵی نەدا و ، وتی : ئەوانە خۆشیان ناوێ و دەترسم ئـاژاوە بـەرپا ببـێ .. ئیمـام شـافیعیی داوای لێ کرد کە سێ رۆژ مۆڵەتی بـدات و ، ئـەویش مۆڵـەتی دا . ئـەوە بـوو لـە شـەوی سێ‌هەمدا والیی کۆچی دوایی کـرد و ، شـافیعییش لـە چنگـی دەربـاز بـوو و هـەتا کۆچـی

---

[١١٤] الوافي بالوفيات ( ١ : ١٧٧ ) .

[١١٥] ئەشهەبی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی داوودی قەیسیی عامیرییە ، کە لە سەردەمی خۆیدا فەقیهی میصـر بـووە و ، هاوەڵی ئیمام مالیک بووە . شافیعیی ئەفەرموێ : میصر لە ئەشـهەب شـارەزاتری فیقـهی هـەڵ نەخسـتووە . لـە سـاڵی ٢٠٤ ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە .

[١١٦] ترتيب المدارك ( ٤٥٣ ) .

دوایی کرد لەوێ مایەوە .[١١٧] هەتا دوای کۆچی دوایی ئیمام شـافیعیی دژایـەتیی بەرامبـەر بە شوێنکەوتووانی مەزهەبەکەی دەکرا .

ئێستاش با سەرنجێکی ئەڵقەی دەرسەکانی ئیمام شـافیعیی بدەیـن : ئیمـام کـە نوێـژی بەجری لـە مزگـەوت بـەجێ دەهێنـا ، دەچـووە شـوێنی دانیشـتنەکەی و قوتابیـیە جـۆراو جۆرەکانی دەستە دەستە دەهاتنە خزمەتی بۆ دەرس خوێندن .

یەکەم جار ئەهلی قورئان ئەڵقەیان دەبەست و هەتا خۆرکەوتن خەریکی قورئـان خوێنـدن دەبوون . کە خۆر هەڵ دەهات ئەهلی حەدیث دەهـاتن و ئەڵقـەیان دەبەسـت و ، لـە بـارەی سانا و تەفسیری فەرموودەکانەوە پرسیاریان لێ دەکرد . کە خـۆر بـەرز دەبوویـەوە ئەڵقـەی فیقهـ و ئیجتیهاد دەهاتن و خەریکی دەرس دەبوون هەتا چێشـتەنگاو و ، پاشـان کۆمـەڵی عەرەبیی و نەحوو و شیعر دەهاتن و ئەوانیش تا نزیکـی نیـوەڕۆ خـەریکی دەرس دەبـوون . پاشان ئیمام هەڵ دەستا ، خوا لێی رازیی بێ .[١١٨]

لەگـەڵ ئەمـەش‌دا هـەموو دەستەیـەک دوای ئـەوەی کـە لـە دەرس خوێنـدن دەبوونـەوە سەرسامی شارەزایی و بلیمـەتیی ئیمـام دەبـوون . بـە تایبـەتیی کـە ئیمـام دوای قورئـان و فەرمووده دە هەزار شیعری هوذەیلی بە إعـواب و غـەریب و و مانـاوە لەبـەر بـوون و ، زۆریـش شـارەزای مێـژوو بـوو ، بـۆ ئەمـەش دوو شـت یارمـەتیی‌یان دەدا ، وەک ئیـبن عەبدولحەکەم ئەڵێت ، عەقڵێکی فراوان و ، مێشکێکی ساغ و سەلیم . لە هەمان کـات‌دا بەوپەڕی ئیخلاصەوە بۆ خوا کاری دەکرد ..[١١٩]

ئێستاش کاتی ئەوەیە هەندێ لەو قوتابیـیە ناودارانەی بناسـین کـە لـە ولاتـی میصـردا پێی گەیاندن :

لە راستیی‌دا خـەڵکێکی زۆر کـەڵکیان لـە زانسـتی ئیمـام شـافیعیی وەرگـرت ، ئەوانـە ناودارەکانیان مێژوونووس و زانایان ناویان تۆمار کردوون و هەریەکە پلەی خۆی وەرگرتـووە. بەڵام وا چاکە لە ناویان‌دا چواریان هەڵ بژێرین کە ئەمانەن : بوەیطـیی و ، موزەنیـی و ، رەبیعی مورادیی و ، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولحەکەم ..

رەبیعی کوڕی سولەیمانی مورادیی ئەڵێت : من و بوەیطیی و موزەنیـی و موحەممـەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولحەکەم چووینە خزمەتی شافیعیی ـ خـوا لێـی رازیـی بـێ ـ

---

[١١٧] توالي التأسيس ( ٨٤ ) .

[١١٨] معجم الأدباء ( ١٧: ٣٠٤ ) .

[١١٩] توالي التأسيس ( ٥٩ ) .

که له سەرەمەرگدا بوو . ماوەی سەعاتێک شافیعیی سەرنجی گرتین .. تەماشاکردنەکەی درێژەی کێشا و ، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و فەرمووی :

« ئەبو یەعقووب ! تۆ ئاسن لە ملتدا دەبێت و دەمریت . تۆش موزەنیی ! لە میصردا تووشی شتاتێک دەبیت و ، ڕۆژێکیش دێتە بەردەمت دەبیتە شارەزاترینی خەڵکی ئەو زەمانە لە قیاسدا . تۆش موحەممەد ! دەگەڕێیتەوە سەر مەزهەبەکەی باوکت . تۆش ڕەبیع ! لە هەموویان زیاتر بە کەڵکی بۆم لە بڵاوکردنەوەی کتێبدا ..

ئەبویەعقووب ! هەستە کاروباری ئەڵقەکە بە دەست بگرە » .

ڕەبیع ئەڵێت : هەروا بوو کە فەرمووی .[120] جا ئەمە چەند کەرامەتێکی ئیمام شافیعیی دەردەخات ..

**یەکەمیان : بوەیطیی** : ناوی یوسفی کوڕی یەحیا بووە و بە ئەبویەعقووب ناوبراوە . خەڵکی بوەیطە لە صەعیدی میصر . گەورترین هاوەڵی میصریی شافیعیی یە . ئیمامێکی مەزن و ، خواناسێکی زاهید و ، فەقیهێکی گەورە و کێوێکی سەرکەشی عیلم و دین بووە. فیقهی لە شافیعیی وەرگرتووە و ، هاوەڵێکی تایبەتییشی بووە . هەتا لە فەتوادانیشدا پشتی پێ دەبەست و ، دوای مردنیشی ئەوی کردە جێنشینی خۆی بۆ سەروکاریی هاوەڵانی . ئەوە بوو ئەویش توانیی چەندین ئیمامی شارەزا پێ بگەیەنێ کە لە سەرانسەری وڵاتدا بڵاوەیان لێ کردبوو و ، بەبێ وچان زانستی شافیعییان بە خەڵکیی دەگەیاند .

ڕەبیع ئەڵێت : ئەبویەعقووب بە لای شافعیەوە خاوەنی پایە و پلەی خۆی بوو . جاری وا دەبوو کەسێک پرسیارێکی لێ دەکرد ، دەیفەرموو : لە ئەبویەعقووب بپرسە . کە وەلامی ئەدایەوە هەواڵی دەدایێ و ، ئیمامیش دەیفەرموو : بەو شێوەیە کە وتوویە . بوەیطیی کتێبێکی بە ناوی ( المختصر ) داناوە کە لە کتێبەکانی شافیعیی بە کورت کراوەیی وەری گرتووە .

کاتێ کە ئیمام شافیعیی لە سەرەمەرگدا بوو وەسیەتی کرد کە ئەڵقەی دەرسەکەی بە بوەیطیی بسپێررێ . جا هەرکەس پێی خۆشە با دابنیشێ و هەرکەسیش پێی ناخۆشە با بڕوا ..[121] لێرەدا موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولحەکەم کە ئەویش

---

[120] طبقات الشافعية ( ٢ : ٩٤ )

[121] توالي التأسيس ( ٨٤ ) .

قوتابی‌یه‌کی لیٚ هاتووی ئیمام بوو ، خۆی به شیاوتر له بوه‌یطـی ده‌زانیـی بـۆ جیٚگـه‌داری مامۆستاکه‌یان و ، له‌بەر ئه‌وه‌ش کـه ئیمـام شـافیعیی لـه مـاڵی ئـه‌وان میـوان بـوو بـوو ناڕازیی بوو ئه‌ڵقه‌که به بوه‌یطی بسپیٚریٚ . ئیتر له ئه‌ڵقه‌که دوور کەوتـه‌وه و ، وازیشـی له مه‌زهه‌بی ئیمام شافیعیی هیٚنا و گه‌ڕایه‌وه سه‌ر مه‌زهـه‌بی مـالیکیی و ، لـه دژی ئیمـام شافیعییش کتیٚبیٚکی به ناوی : « الرد علی الشافعي فیما خالف الكتاب والسنة » دانا. به‌مه سه‌رگه‌ردانیی رووی له‌و پیاوه کـرد و لـه جیـاتیی ئـه‌وه‌ی ریٚـز لـه شـافیعیی بگـریٚ و پاداشتی چاکه‌ی بداته‌وه که‌وته دژایه‌تیی و سه‌ره‌نجامیش هه‌ر ماندووبوونی بۆ مایـه‌وه و ، خوای گه‌وره‌ش به‌ڵای بۆ نارد و زۆر به زه‌حمه‌ت لیٚی ده‌رباز بوو .[١٢٢]

**دووه‌میان :** موزه‌نیـی : ئـه‌بوئیبراهیم ئیسـماعیل ی کـوڕی یه‌حیایـه ، کـه ئیمـام شافیعیی به ( ناصر المذهـب ) نـاوی هیٚنـاوه ، خـاوه‌نی زانسـتیٚکی زۆر بـووه و به‌ڵگـه‌ی به‌هیٚزی به‌کار هیٚناوه . هـه‌تا ئیمـام شـافیعیی وه‌هـا وه‌سـفی کـردووه کـه ئه‌گـه‌ر له‌گـه‌ڵ شه‌یتانیش‌دا به‌رابه‌رکیٚ بکات ئـه‌وا ئـه‌ویش ده‌بـه‌زیٚنیٚ . خـاوه‌نی زوهـد و وه‌ره‌ع بـووه و ، تـه‌مـاعی به دنیـا نـه‌بووه . خـاوه‌نـی چـه‌نـد کـتیٚبیٚکـه بـه نـاوی ( الجـامع الكبـير ) ، ( الجامع الصغير ) ، ( المختصر ) ، ( المنثور ) ، ( المسائل المعتبرة ) ..

زۆریٚـک لـه زانایـانی خۆراسـان و عـیٚراق و شـام زانستیان لـه موزه‌نیـی وه‌رگرتـووه . ره‌مـه‌زان شـه‌ش رۆژی مـابـوون له ساڵی دووصـه‌د و شـه‌سـت و چواری کۆچیـی‌دا کۆچـی دوایی کرد .

**سیٚهه‌میان :** ئه‌بوموحه‌ممه‌د ره‌بیعی کوڕی سوله‌یمانی موراد‌ییـه . لـه سـاڵی صـه‌د و حه‌فتا و چواری کۆچیی‌دا له دایک بـووه و پـه‌یوه‌ندیی بـه ئیمـام شـافیعی‌یه‌وه کـردووه و ، زانستیٚکی زۆری لیٚ وه‌رگرتووه . له گیٚڕانه‌وه‌ی فه‌رمووده‌دا ( ثقـة ) بـووه و لـه مزگـه‌وتی عه‌مری کوڕی عاص له شاری فوسطاطی میصردا بانگ‌ویٚژیش بووه . ئیمـام زۆری خـۆش ویستووه و ، هاوه‌ڵانی ئیمامیش له‌سه‌ر ئه‌وه یه‌ک ده‌نگن که چـاکترین کـه‌سـیٚ کـه جیٚـی متمانه بیٚ له گیٚڕانه‌وه‌ی کتیٚبه‌کانی شافیعیی‌دا ره‌بیعـی مورادیـی هـاوه‌ڵ و خزمـه‌تکاری بووه . هه‌تا ئه‌گه‌ر له ریوایه‌تیٚکدا جیاوازیی لـه نیٚوان ئـه‌و و موزه‌نیی‌دا ببوایـه ، ئـه‌وا

---

[١٢٢] سه‌یری ترتيب المدارك ی قاضیی عیاض بکه .

# فراوانیی زانستی شافیعیی

زانستی شافیعیی هەر تەنها بریتیی نیە لەو فیقهـ و ئیجتیهادەی کە بە دەستی هێناوە ، بەڵکو هەموو بەشە جۆر بە جۆرەکانی زانست دەگرێتەوە کە ئەو دەستێکی باڵای تیایاندا هەبووە . جا دیارە زانینی رادەی ئەم زانستە فراوانە بێسنوورە هەروا ئاسان نیە و هەموو کەسێ توانای نیە لێی ئاگادار بێ ، مەگەر کەسانێکی زۆر کەم لە گەورە پیاوان و کەڵەزانایان .. جا پشت بە خوا هەوڵ دەدەین دەستمان لە هەندێ لە فەزڵ و شارەزایی ئیمام لەو کەڵە پیاوانەوە گیر ببێ ..

کە سەرنجی ژیانی ئیمام دەدەین ، هەر لە کاتێکەوە کە تەمەنی حەوت ساڵان بووە و هەموو قورئانی لەبەر بووە ، تا ئەجەلی یەخەی پێ گرتووە ، بۆمان دەردەکەوێ لە هەموو خۆشیی و لەزەتێکی ئەم دنیایە زاهید بووە و ، بە هەموو گیانێکیەوە .. بە لاشە و رۆح و عەقڵ و زیرەکییەوە ، هەوڵی داوە زانست بە دەست بهێنێ و پاشان رەفتار بەو زانستەی بکات ..

ئەوەتا خۆی وەسفی ئەو حەزبوونە بێوێنەیەی دەکات ، جارێکیان پرسیاری لێکرا: ئارەزووت بۆ وەرگرتنی زانست چۆنە ؟ فەرمووی : « کاتێک کە پیتێک لەو پیتانەی کە نەم بیستوون دەبیستم ، هەموو ئەندامەکانم ئاواتەخوازن گوێیان هەبێ ، تا ئەو لەزەتەی بە هەردوو گوێم گەیشتووە بەوانیش بگات » .

لێیان پرسیی : ئەی حیرص و تەماعت چۆنە بۆی ؟ فەرمووی : « وەک حیرص و تەماعی ئەو کەسەی کە هەر خەریکی پارە کۆکردنەوەیە و هیچی لێ بەشی کەس نادات ».

لێیان پرسیی : ئەی هەوڵی چۆن بۆ دەدەیت ؟ فەرمووی : « وەک هەوڵدانی ئەو ئافرەتەی کە بۆ دۆزینەوەی کورە تاقانە ون بووەکەی هەوڵ دەدات » .[١٢٧]

---

١٢٧ توالي التأسيس ( ٦٢ ).

جا کەسێ ئەوە غیرەت و ، ئەوە هـەوڵ و کۆششـی بێـت ، لـە هـەمان کـاتدا خـاوەنی زیرەکی‌یـەکی بێ‌وێنـە بێـت ، دیـارە دەگاتـە پلەیـەکێ کـە تەنـها کـەمێ لـە ئادەمی‌یـەکان دەی‌گەنێ ..

ئەوەتا قوتابیانی زانست تێ دەگەیـەنێ کـە پێویسـتـە ئەوپـەڕی توانـا هـەوڵ بـدەن و بـۆ بەدەست هێنانی زۆرترین زانست کەمتەرخەمیی نەکەن و ، ئارامیش لەسەر هەموو کۆسـپ و نارەحەتی‌یەکێ بگـرن و ، خـاوەنی ئیخـلاص و نییـەتێکی پـاکیش بـن و ، هـەردەم داوای کۆمـەکیی و یارمـەتیی خواش بکەن ، چونکە بـەبێ کۆمـەکیی ئـەو هیـچ خـێر و چاکەیـەکێ دەستگیر نابێت کە دەفەرموێ :

( فحق على طلبة العلم بلوغ غاية جهدهم في الإستكثار من علمه ، والصبر على كل عارض دون طلبه ، وإخلاص النية لله في استدراك علمه : نصاً واستنباطاً ، والرغبة إلى الله في العون عليه ، فإنه لا يُدرك خير إلا بعونه ) .[١٢٨]

هەروەها دەری دەبڕێ کە شارەزابوون لە ئەحکامەکانی خوا و ، بڵاوکردنەوە و کارکردن بەو ئەحکامانە ، ئیماندار بە بەرزیی دین و دنیا دەگەیـەنێ و ، شـک و گومـانی لێ دوور دەکەوێتـەوە و ، دڵـی بـە حیکمـەت روونـاک دەبێتـەوە و ، شـایانی ئـەوەش دەبێـت کـە پێشەوایەتیی ئیماندارانی پێ ببەخشرێت ، کە دەفەرموێ :

( فإن من أدرك علم أحكام الله في كتابه : نصاً واستدلالاً ، ووفقه الله للقول والعمل بما علم منه ، فاز بالفضيلة في دينه و دنياه ، وانتفت عنه الريب ، ونوَّرت في قلبه الحكمة ، واستوجب في الدين موضع الإمامة ) .[١٢٩]

ئێستاش بە کۆمەکیی خـوا کـەمێکێ لـە زانسـتـە جۆربـەجۆرەکانی ئیمـام شـافیعیی بـۆ ئازیزان باس دەکەین :

## ( ١ ) زانستەکانی قورئان :

هەرکەسێ بیـەوێ لـە ئەحکامـەکانی شـەریعەت شـارەزا بـبێ پێویسـتـە پێش هـەموو شتێکێ لە قورئانی پیرۆز شارەزا ببێ و ، لێی تێ بگا و ، لە زانسـتـەکانی ئاگـادار بـبێ و ،

---

[١٢٨] الرسالة ( ١٩ )

[١٢٩] الرسالة ( ١٩ ) .

بە وردیی لێی بکۆڵێتەوە . جا شتێکی نەگونجاوە کەسێك بتوانێ لە قورئان تێ بگا ، ئەگەر بە جوانیی و پوختیی شارەزای زمانی عەرەب نەبێت و ، شێوە زمانی هۆزەکان نەزانێت و ، لەزەت لە بەلاغەتی عەرەبیی نەبات .

دیارە ئیمام شافیعیی ـ خوا لێی رازیی بێ ـ لە هەموو کەس زیاتر لەو بوارەدا سەرکەوتوو بوو .. ئەوە بوو چووە بیابان ناو رەوانبێژترین هۆزی عەرەب ، کە هۆزی هوذەیلە و ، بۆ ماوەی حەڤدە ساڵ لە گەڵیاندا ژیانی دایە سەر .. وەك بیابان نشینێك لەگەڵیاندا باری دەکرد و باریشی دەخست .. بە جوانیی فێری زمانیان بوو و ، شیعرەکانی لەبەر کردن و ، بە تەواویی وەك ئەندامێکی هۆزەکەی لێ هات .. ئیتر ئەوە بوو بە ئاسانیی لە واتاکانی قورئان ئەگەیشت .. ئەوەندە شارەزای قورئان بوو ، دەت وت وا لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا .

بۆیە سوفیانی کوڕی عویەینەی مامۆستای ئیمام شافیعیی لە زانستی فەرموودەدا ، هەرکاتێ پرسیاری تەفسیر و فەتوای بۆ بهاتایە ، ئاوڕی بۆ لای شافیعیی دەدایەوە ، و دەیوت : پرسیار لەمە بکەن ..[130]

ئەبو حەسسانی زیادیی شاهێدیی لەسەر ئەوە دەدا کە کەسی نەدیوە وەك ئیمام شافعیی بەتوانا بێت بۆ دەرهێنانی ماناکان لە قورئاندا و نموونە هێنانەوە لەسەر ئەوە لە زماندا ، کە ئەڵێت : « ما رأيت أحداً أقدر علي انتزاع المعاني من القرآن ، والإستشهاد على ذلك من اللغة من الشافعي » .[131]

داوودی کوڕی عەلی ئیمامی ئەهلی ظاهیر لە ستایشی شافیعییدا ئەڵێت : ئیسحاقی کوڕی راهویە پێمی وت : من و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل چووینە خزمەتی شافیعیی لە مەککەدا و ، لە بارەی چەند شتێکەوە پرسیارم لێ کرد ، دەبینم زمان پاراو و ، رەوشت جوانە . کە لەلای هەستاین کۆمەڵێك لە تێگەیشتوانی قورئان پێمیان گەیاند کە لەسەردەمی خۆیدا زاناترین کەس بووە لە ماناکردنی قورئاندا ..[132]

جا هەروەك لە کتێبی ( الرسالة ) دا چەندین ( ( أصول ) ی لە قورئان دەرهێناوە کە ئادەمیزاد سەرسام دەبێت ، هەروەها بۆ تەفسیرکردن هەر ریوایەتێك بە تەواویی جێی متمانە نەبووبێ ، پشتی پێ نەبەستووە بۆیە پشتی بە موجاهید دەبەست ، هەروەك بوخارییش لەوەو دوا پشتی پێ دەبەست ..

---

[130] الإنتقاء ( ٧٠ ) .

[131] توالي التأسيس ( ٥٨ ) .

[132] توالي التأسيس ( ٥٨ ) .

## ( ٢ ) زانستی فەرمووده :

ئیمام شافیعیی تەمەنی نەگەیشتبووە دە ساڵان رووی لە حەرەمی مەککیی نا و ، خۆی گەیاندە خزمەتی مامۆستای حەرەم ، فەرموودەناسی گەورەی مەککە ، سوفیانی کوڕی عویەینە و ، دەستی بە وەرگرتنی فەرموودە کرد و ، ئەوەندەش دەستکورت بوو ناچار بوو فەرموودە لەسەر ئێسقان و لقی پانی دارخورما و لە سەر دیوی دووهەمی کاغەزی فەرمانگەکان بنووسێتەوە ، پاشان ( موطــأ ) ی ئیمام مالیکی لەبەر کرد و ، هێشتا تەمەنیشی نەگەیشتبووە سیانزە ساڵیی خۆی گەیاندە مەدینە بۆ خزمەتی ئیمام مالیک و ئەو فەرموودانەی کە لەلای ئەویش و لەلای مامۆستاکانی تریش هەبوون هەمووی نووسینەوە و ، زۆرێک لە فەرمایشت و فەتوای هاوەڵانی نووسییەوە و ، بە چاکیی شارەزای فیقهی دانیشتوانی مەدینە بوو .

ئیبن حەجەر دەری بڕیوە کە شافیعیی فەرموودەی زۆری لەبەر دەکرد ، بەڵام مامۆستای زۆری نەبوون ، چونکە سەرەڕای زانستی فەرموودە سەرگەرمی زانستی فیقهیش دەبوو تا ئەوەی کە خوا ویستی لەسەر بوو دەستی کەوت .[١٣٣] هەروەها دەری بڕیوە کە فەرموودەکانی ئەحکام جگە لە کەمێکیان هەر هەموویانی بەلاوە بووە ، ئەمەش بە بەڵگەی وتەی ئیمام ئەبوبەکری کوڕی خوزەیمە ، کاتێ کە پرسیاری لێ دەکرێ کە : ئایا سوننەتێکی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە شافیعیی لە کتێبەکانیدا نەینووسیبێ . ؟

ئەڵێ : نەخێر .[١٣٤]

ئیمام ئەحمەدیش دەری بڕیوە کە ئیمام شافیعیی لە هەموو کەسێک زیاتر شارەزای قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ .[١٣٥]

موزەنییش وتوویە : گوێم لە شافیعیی بووە کە دەیفەرموو : « چەندین شەو بە دوای تەنیا فەرموودەیەکدا ڕێگام بڕیوە » .[١٣٦]

---

[١٣٣] توالي التأسيس ( ٥٣ ) .
[١٣٤] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥١ ) .
[١٣٥] آداب الشافعي و مناقبه (٥٥ ) .
[١٣٦] توالي التأسيس ( ٥٢ ) .

لەگەڵ ئەوەشدا بە زۆر بێ و بـۆر بـێ رازیـی نـەبووە . بـەڵکو هـەوڵی داوە فـەرموودەی صەحیح کۆ بکاتەوە و ، پشتیشی لـە هـەواڵی لاواز و بێگیـان کـردووە ، بـە رادەیـەک کـە ئیمام نەوەویی دەری دەبڕێ کە پێ نازانێ هیچ فەقیـهێک وەک شـافیعیی بایـەخی بـەوە دا بێ کە فەرموودەی صەحیح بکاتە بەڵگەی حوکمەکانی و لە لاواز جیای بکاتەوە.[137]

جا هەرچەندە ئیمام شافیعیی فەرموودەی صـەحیحی دەست بکەوتایـە ، هێشـتا دڵـی ئـاوی نـەدەخواردەوە و دەترسـا لاواز بێـت . هـەموو فەرموودەناسێک هـەمان هەڵوێسـتی هەبووە . ئەوەتا صەحیحی بوخاریی کە جگە لـە دووبارەبووەکـان بریتـیـیـە لـە دوو هـەزار فەرموودە ، کە لە سێصەد هەزار فەرموودە کۆکراوەتەوە و ، صـەحیحی موسـلیمییش بـە هـەمان شێوە . هـەروەها موسـنەدی ئیمـام ئەحمـەدیش ـ هەرچـەندە فـەرموودەی لاوازی تێدایە ـ لە زیاتر لە حەوتصەد و پەنجا هەزار فەرموودە کۆی کردۆتەوە ..

ئەوەی کە پێویستە هەمیشە لە یادمان بێت ئەوەیە کە زانایـان هـەر هـەموویان لەسـەر رەوشت بەرزیی و کامڵیی شافیعیی یەکدەنگن بە رادەیـەک کـە هیـچ کـەس لـە هــــیچ بـوارێکدا گلەیی لێ نەبێت .[138]

حەرمەلەی کوڕی یەحیا لە شـافیعیـیەوە دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویـە : « هـەرگیز درۆم نەکردووە و ، هەرگیز سوێندیشم ، چ بە راست و چ بە درۆ ، بە خوا نەخواردووە ».[139]

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوحاتەمیش لە ئەبوموحەممەدەوە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویە : ( محمد بن إدريس فقيه البدن، صدوق اللسان ) .[140] واتە : لە هەموو کـردار و گوفتارێکیدا خوای لە یادە و لە سنووری حوکم و فەرمانەکانی دەرناچێت .

ئەبوزەرعەش ، کە یەکێکە لە کەڵـە زانایـانی فـەرموودە و ، صـەد هـەزار فـەرموودەی لەبەر بووە و ، لە ساڵی ٢٦٤ ی کۆچیی لە رەی کۆچی دوایی کردووە ، وتوویـە : شـافیعیی فەرموودەیەکی هەڵەی بە لاوە نیە .[141]

ئەبوداوودیش ئەڵێت : پێنازانم شافیعیی فەرموودەیەکی هەڵەی بە لاوە بێ .[142]

---

[137] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥١ ) .

[138] وفيات الأعيان ( ١ : ٥٦٦ ) .

[139] توالي التأسيس ( ٦٧ ) .

[140] آداب الشافعي ومناقبه ( ٨٩ ) .

[141] الوافي للصفدي ( ٢ : ١٧٣ ) .

[142] شذرات الذهب ( ٢ : ٩ ) .

ئەبوحاتەمی رازییش ئیمام شافیعیی بە ( صدوق ) دەزانێ .

ئیمام ئەحمەدیش ئەوەندە متمانەی بە ئیمام شافیعیی دەبێت بێ‌پەروا فــەرموودەی لێ دەگێڕێتەوە .

پێشەوایانی فەرموودە بە وردیــی لــەوە کۆڵیونەتــەوە کــە داخــۆ صــەحیح‌تریــن ســەنەدی فەرموودە کامە بێت ؟

لە بوخاری‌یەوە دەگێڕنەوە وتوویە : صەحیح‌ترینی هەموو سەنەدەکان : لە مــالیکەوە ، لە نافیع ەوە ،[143] لە ئیبن عومەرەوە . دوای بوخارییش کەسانی تر هاتوون و دەریان بڕیــوە کە : پێویستە شافیعییش بخرێتە سەر ئەم زنجیرەیە لەبەر ئەوەی کە زانایان رایــان لەســەر ئەوەیە کە شافیعیی مەزن‌ترین کەسێکە فەرموودەی لە مالیک وەرگرتبێ . بەمە دەوترێ : شافیعیی ، لە مالیک ەوە ، لە نافیع ەوە ، لە ئیبن عومەرەوە .. لــە چەرخــەکانی دواوەش دا زانایان رایان لەسەر ئەوە بووە کە چاکترین ریوایــەتیش ریوایــەتی ئیمــام ئەحمــەدە ، لــە شافیعیی‌یەوە ، لە مالیک ەوە ، لە نافیع‌ەوە ، لە ئیبن عومەرەوە .[144]

هەموو زانــایــان رایــان لەســەر ئەوەیە کە ئیمام شــافیعیی یەکەم کەسێکە کــە زانســتی ( أصول الفقه ) ی داناوە ، بەڵام کەمێک بەوە دەزانــن کــە یەکــەم کەسیشــە لــە دانــانی زانستی ( أصول الحديث ) دا ، کە زانایانی ئەم دواوە ناویان ناوە ( مصطلح الحديث ).

ئیمام شافیعیی لەم زانستەدا چەندین ( اصطلاح ) ی داناوە کە هیــچ کەسێک پێشــی نەکەوتووە . وەک ئەفەرموێ : ( إذا إتصل الحديث عن رسول الله ﷺ وصح الإســـناد به، فهو سنة ) .[145]

هەروەها فەرموویە : ( ليس الشاذ ـ من الحديث ـ أن يروي الثقة حديثاً لم يروه غــيره، إنما الشاذ من الحديث : أن يروي الثقات حديثاً ، فيشذ عنهم واحد فيخالفهم ).[146]

هەروەها فەرموویە : ( إذا قرأ عليك المحدث ، فقل : حدثنــا ، وإذا قــرأت علــى المحدث ، فقل : أخبرنا ) .[147]

---

[143] نافیعی مەدەنیی یەکێکە لە ئیمامانی تابیعینی مەدینە . لە بنەڕەتدا دەیلەمی‌یە و بە منداڵیی وەک بەندە کەوتــە دەست ئیبن عومەر . ساڵی (١١٧) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[144] توالي التأسيس ( ٢١ ) .

[145] آداب الشافعي ومناقبه ( ٢٣٢ ) .

[146] آداب الشافعي ( ٣٢٣ ) .

[147] آداب الشافعي ( ٩٩ ) .

هەروەها فەرموویە : ( ولیس المنقطع بشيء ما عدا منقطع ابن المسیّب ) .[١٤٨]

هەتا لە جەرح و تەعدیل‌دا مەردانە حەق دەڵێت و ، بێباکە خەڵک پێی خۆشە یان نەء.

تەنها رەزامەندیی خوای مەبەستە .. ئەحمەدی کوڕی سورەیج ئـەڵێت : گوێـم لـە شـافیعیی بوو دەی‌فەرموو : « ئەڵێن : لایـەنگیریی دەکـات . ئەگـەر لایـەنگیرییمان بکردایـە ، ئـەوا لایەنگیریی زوهەرییمان دەکرد . فەرموودەی مورسەلی زوهەرییش هیچی تیا بەسـەر نیـە، چونکە دەی‌بینیین لە سولەیمانی کوڕی ئەرقەمەوە ریوایەت دەکات » .[١٤٩]

ئیبن عەبدولحەکەم ئەگێڕێتەوە : گوێم لە شـافیعیی بـوو ، کـاتێک کـە نـاوی حـەرامی کوڕی عوثمانیان لەلادا برد ، فەرمووی : ( الحدیث عن حرام بن عثمان حرام ) .[١٥٠]

هەروەها ئیبن عەبدولحەکەم ئەگێڕێتەوە : شـافیعیی فەرموویـە : کتێبـەکانی واقیدیـی درۆن ) .[١٥١]

هەروەها لێی دەگێڕنەوە کە وتوویە : شافیعیی فەرموویە : ( ریوایەتی بەشـیری کـوڕی نوهەیک ناچەسپێ ).[١٥٢]

ئیمام شافیعیی بۆ تێگەیشتنی سوننەت زۆر لێ‌هاتوو بووە . نازیزان دەزانـن کـە سـوننەت دوو بەشە : ریوایەت و دیرایەت : ریوایەت : زانسـتێکە فـەرموودە و کرداری پێغەمبـەرﷺ ، لەگـەڵ گێڕانـەوە و رێـک و پێـک کردنـی ( لفـظ) ی فەرموودەکـە دەگرێتـەوە. دیرایـەش : زانستێکە بریتی‌یە لە حەقیقەت و مەرج و جۆر و ئەحکامی ریوایەت و .... هتد .

جا ئیمام شافیعیی لە زانسـتی ریوایـەت‌دا زۆر چـاک شـارەزا بـووە . بـەڵام لـە زانسـتی دیرایەت‌دا لە سەردەمی خۆی‌دا کەسێ نەی‌توانیوە شان لە شانی بدات و ، لـە تێگەیشـتنی

---

[١٤٨] آداب الشافعي ( ٢٣٢ ) مەبەسـتی لەو فەرموودەیە کە کەسێک هاوەڵ نەبێت و بڵێـت : پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـە: ئیمام شافیعیی لەو جۆرە فەرموودانە تەنها فەرموودەی سەعیدی کوڕی موسـەییەبی قبووڵـە ، چونکـە ئـەو عەدلـە و لـە عەدلیشەوە ریوایەت دەکات ..

[١٤٩] آداب الشافعي ( ٨٢ ) . زوهەریی : ناوی موحەممەدی کوڕی موسلیمی کوڕی شەهابە ، لە نەوەی زوهـەرە . یەکـەم کەسـە کە کتێبی فەرموودەی داناوە و ، یەکێکە لـەو کەڵـە زانایانـەی کـە فـەرموودەیان لەبـەربوون . تابیعی‌یـە و سـاڵی ( ١٢٤ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە . سولەیمانی کوڕی ئەرقـەمیش ئـەبوموعاذی بەصری‌یـە ، کـە زانایـان لەسـەر لاوازیی ئەو یەکدەنگن ..

[١٥٠] آداب الشافعي ( ٢١٨ ) . حەرام کوڕی عوثمان ئەنصاریی مەدەنی‌یە . مالیک و یەحیا فەرموویانە : ( ثقة ) نیـە . ئیبن حەببان وتوویە : لە شیعەگەریی‌دا رۆچووە و ، سەنەدەکان ناوەژوور دەکات .. .

[١٥١] آداب الشافعي ( ٢٢٠ ) . ذەهەبییش وتوویە : ( وقد استقر الإجماع علی وهنه ) .

[١٥٢] آداب الشافعي (٢٢٠) . ئـەو بەشـیرە تابیعی‌یـە و ، یەکێکـە لەوانـەی کـە لـە ئـەبوهورەیرەوە ریوایـەت دەکـات . ئەبوحاتەم حەدیثی ئەوی بە (حجة ) وەرنەگرتووە . بە لای ئەحمەد و نەسـائیی و عیجلی‌یەوە ( ثقة) یە .

دەقـەکانی سـوننەت و دەرهێنـانی مانـای ورد و قـووڵ و ، دەرهێنـــانی حوکـمدا یەکجـار لیٚهاتوو بووە . زۆر جـار ڕێـی لـە مانـا و وردەکـاریی وەهـا دەکـەوت کـە کەڵـە زانایـان و فەرموودەناسان ڕێیان لیٚ نەدەکەوت ..

لە پێشەوە باس کرا کە چۆن سوفیانی کوڕی عویەینــەی مامۆستای دڵـی بـە شـافیعیی خۆش بـوو و متمانـەی بـە زانسـتی ئـەو دەکـرد .. ئـەوە بـوو بـە جوانیــی فیقـهی ئـەو فەرموودەیەی بۆ باس کرد کە پێغەمبەر ﷺ صەفیەی هاوسـەری ـ خوا لێـی ڕازیـی بـێ ـ لەگەڵدا بوو و تووشی پیاوێکی ئەنصاریی بوون و ، سوفیانیش زۆری پیٚ خۆش بوو .

نەک هەر سوفیانی کوڕی عویەینە بەڵکو هەموو زانایــان ئاگـاداری لیٚهـاتوویی ئیمـام شافیعیی بوون ، ئەوەتا هیلالی کوڕی عەلاء ئەڵێت : « رحم الله الشافعي ، هــو الــذي فتح لأصحاب الحديث الأقفال » .[153]

ئەمەش بەو بۆنەوە بوو کە پشتی بە فەرموودە دەبەست . موزەنیــی ئـەڵێت : شـافیعیی فەرموویە : « ئەگەر سوننەتێکی صەحیحتان دەست کـەوت شـوێنی بکـەون و ئـاوڕ بـە لای وتەی هیچ کەسەوە نەدەنەوە » .[154] تا لە ئەنجامدا نازناوی ( ناصر السنة ) ی لیٚ نرا .

عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولحەمیدی کوڕی مەهران[155] ئەڵێت : ئەحمــەدی کـوڕی حەنبـەل پێمـی فـەرموو : « ئـەوە بـۆچ تەماشـای کتێبـەکانی شـافیعیی ناکـەیت ؟! لەوکاتـەوە کتێـب نووسراوە هیچ کەس کتێبی نەنووسیوە لە شافیعیی زیاتر شوێنکەوتەی سوننەت بێت ».[156]

هەروەها ئیمام ئەحمەد فەرموویە : « ئەگەر شافیعیی صەحیحیی فەرموودەیەکی لـەلا بسەلمایە ، کاری پیٚ دەکرد » .[157] هەروەها فەرموویە : « چاکترین کاری شــافیعیی ئـەوە بوو کە ئەگەر فەرموودەیەکی ببیستایە و لـەلای نەبوایـە ، کـاری پـیٚ دەکـرد و ، وازی لـە وتەکەی خۆی دەهێنا » .[158]

---

[153] تهذيب الأسماء واللغات ( ١: ٦٤ ) .

[154] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .

[155] حافیظ و فەقیهـ بووە . هاوەڵی ئیمام ئەحمەد بووە . لە ئیسحاقی ئەزرەق و ڕۆحی کوڕی عوبادە و خەڵکی تریشـەوە فەرموودەی ریوایەت کردووە ، نەسسائییش فەرموودەی لیٚ وەرگرتووە و بە ( ثقة)ی دانـاوە . سـاڵی (٢٧٤ ) ی کۆچیـی کۆچی دوایی کردووە .

[156] آداب الشافعي (٦١ ) ، توالي التأسيس ( ٥٧ ) .

[157] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .

[158] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .

تیرمیذییش ئەڵێت : گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو کە دەی فەرموو : ( رحم الله الشافعي ، لقد كان يذب عن الآثار ) .[159] واتە : بەرگریی لە فەرموودە دەکرد ..

عەبدوڕڕەحمانی کـوڕی مـەهدییش ـ کـە ئیمـام شـافیعیی کتێبـی ( الرســالة ) ی بـۆ نووسیی ـ ئەڵێت : « سوفیانی ثەوریی مرد و وەرەعیش لەگەڵیا مرد .. شافیعییش مـرد و سـوننەتەکانیش لەگەڵیـا مـردن .. ئەحمـەدیـش دەمـرێ و بیـدعـەتەکانیش سـەر دەردەهێنن »..[160]

حەولەرەی کوڕی موحەممەدی مینقەرییش وتوویە : بە دوو شت دەردەکـەوێ کەسێك شوێن سـوننەت کـەوتبێ : بـە خۆشویستنی ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل و ، نووسـینەوەی کتێبەکانی شافیعیی .[161]

ئیمام شافیعیی خۆیشی فەرمایشتی زۆری هەن تیایانا دەری دەبڕێ کە پێویسـتە بڕیـار بڕیاری سوننەتی پێغەمبـەری خـوا بێـت و ، کـە سـوننەت هاتـە بـەرەوە هـەموو حوکـم و بڕیارێك دەدرێتە دواوە ، چونکە هیچ کەس ناتوانێ سوننەت هەر هەمووی کۆ بکاتەوە و ، هیچ کەسیش لە تێگەیشتنی سوننەتدا بێ هەڵە و بێکەم و کوڕیی نیە ..

ئەوەتا رەبیع دەگێڕێتەوە کە شافیعیی فەرموویە :

« کەس نیە سوننەتێکی پێغەمبەری خوای ﷺ لەدەست دەرنەچێ و ، لێی پەنهان نەبێ. جا من هەرچیم وت و ، هەر ( أصل ) ێکم دانـا و ، لـە پێغەمبـەری خـواوە فەرمایشـتێك هاتبوو پێچەوانەی وتەکەی من ، ئەوا فەرمایشت فەرمایشتی پێغەمبەری خوایـە ﷺ و ، ئەوە قسەی منیشە » .[162] ئەم وتەیەی هەر دووبارە دەکردەوە ..

هـەروەها ـ وەك ئەبولـەور دەیگێڕێتـەوە ـ فەرموویـە : « هـەر فەرمایشـتێك لـە پێغەمبەرەوە ﷺ بێت ، ئەوە وتەی منیشە ، ئەگەر چیی لێمەوە نەشتان بیستبێ » .[163]

هەروەها ـ وەك کەرابیسیی دەیگێڕێتەوە ـ فەرموویـە : « ئەگـەر بەڵگەیـەکتان بـەرچاو کەوت لە رێدا فڕێ درا بوو ، ئەوە بە زمانی منەوە بیگێڕنەوە ، من وتوومە ».[164]

---

[159] توالي التأسيس ( ٥٧ ) .
[160] طبقات الشافعية ( ٢ : ٢٩ ) .
[161] الانتقاء ( ٨٩ ) .
[162] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١١ ) .
[163] آداب الشافعي (٩٤).
[164] آداب الشافعي ( ٩٤ ) .

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش ئەفەرموێ : شـافیعیی پێمـانی فـەرموو : « ئێـوە لـە مـن زاناترن بە فەرموودەش و بـە پیـاوان .. ئەگـەر فەرموودەیـەک صـەحیح بـوو ، ئەگـەرچیی کووفیی ، یان بەصریی ، یان شامیی بێت ، ئاگادارم کەن ، ئەگەر صـەحیح بـوو ، بـا خـۆم بگەیەنمە لای » .[165]

هەروەها ـ وەک ڕەبیع دەیگێڕێتەوە ـ فەرموویە : « ئەگەر لە کتێبی مـندا پێچەوانـەی سوننەتی پێغەمبەری خواتان ﷺ ، ئەوا شوێن ئەو سوننەتە بکەون و ، واز لـە وتەکـەی مـن بهێنن » .[166]

دیسـان ڕەبیـع ئـەڵێت : هـەروەها گوێـم لێـی بـوو دەیفـەرموو : « هــەر کـاتێک لــە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەیەکی صەحیحم گێڕایەوە و ، شوێنی نەکـەوتم ، ئـەوا بـە شاهێدتان دەگرم کە من عەقڵم لە دەست داوە » .[167]

هەروەها ـ وەک ڕەبیع دەی گێڕێتـەوە ـ فەرموویـە : « هـەر مەسـئەلەیەک باسـم لێـوە کردبێ و ، بـە لای ئـەهلی فیقهیشــەوە ، بـە پێچەوانـەی ئـەوەی کـە مــن وتوومــە ، فەرموودەیەک لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بە صەحیح دەرچوو ، ئەوا من لەو وتەیـە پاشـگەز بوومەتەوە ، ئیتر سا لە ژیانمدا بێت یان لە دوای مردنم بێت » .[168]

هەروەها دەگێڕنەوە کە فەرموویە : ( إذا صَحَّ الحديث فهو مذهبي ) .[169]

هەروەها ـ وەک موزەنیی دەیگێڕێتەوە ـ فەرموویە : « ئەگەر سوننەتێکی صـەحیحتان دەستکەوت ، ئەوا شوێنی بکەون و ، ئاوڕ بەلای وتەی کەسەوە مەدەنەوە » .[170]

هەروەها فەرموویە : « ئەگەر فەرموودەیەک بە صەحیح دەرچوو ، وتەکەی من بکێشـن بە دیواردا » .[171]

بەم فەرمایشتانەی دەیەوێ موسڵمانان بە شاهێد بگرێ کە ئامادە نیە لە خۆیـەوە هیـچ شتێک بۆ دینی خوا زیاد بکات و ، بـا بـە بۆنـەی متمانـەی خەڵکـەوە بـە دیـن و وەرەع و خواناسییەکەی وا تێ نەگەن هەرچی ئەم نووسیی دەکرێتە بەشێک لە دینی خوا .. جا هەر

[165] آداب الشافعي ( ٩٤ ) .
[166] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .
[167] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .
[168] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .
[169] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .
[170] توالي التأسيس ( ٦٣ ) .
[171] الوافي بالوفيات ( ٢ : ١٧٣ ) .

وتەیەکی بە قورئان و فەرمودە پشتگیریی لێ نەکرا ، ئەوا با هەموان بزانن کە لێی پاشگەز بۆتەوە .

بوەیطیی لە شافیعییەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویە :

« ئەم کتێبانەم داناوە و دریغیم نەکردووە ، بەلام هەر دەبێ هەلەیان تێدا بێت ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴾ ( النساء : ٨٢ )[١٧٢] جا لەم کتێبانەمدا هەر شتێکتان دیی کە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوو ، وا لێی پاشگەز بوومەوە »[١٧٣] .

کارێک کە یەکجار شافیعیی توورە دەکرد بریتیی بوو لەوەی کە زانایەک پشت لە سوننەت و بەلگەی شەرعیی هەل بکات و ، بۆ پشتگیریی وتەکەی وتە و رای زانایان بێنێتەوە ، ئەگەرچیی لە کەلەزانایان و گەورە موجتەهیدان بێت .. ئەوە بوو جارێکیان لەگەل ئیسحاقی کوڕی راهویەدا وت و وێژ و بەرابەرکێیان دەکرد .. کە گوێی لە ئیسحاق گرت ، لە یەکێ لە ناسراوانی پرسیی : ئەمە کێیە ؟ وتی : ئەمە ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەنظەلیی کوڕی راهویەی خۆراسانییە . شافیعیی فەرمووی : « ئەمە تۆی ئەهلی خۆراسان وای دادەنێن کە فەقیهیان بیت ؟ » . ئیسحاق وتی : وای دادەنێن . شافیعیی فەرمووی : « خۆزگە کەسێکی تر لەو جێگەتەدا بوایە ، تا فەرمانم بدایە هەر دووگوێیان لە بنا دەربهێنایە . من پێت دەلێم : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە ، تۆش ئەلێی : عەطاء و ، طاووس و ، مەنصوور و ، ئیبراهیم و ، حەسەن رایان وەها نیە ؟! ئایا کەس دەتوانێ بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلگە بهێنێتەوە ؟! »[١٧٤] .

هەروەها بە گالتەیەکی جەرگ بڕەوە لەو کەسە توورە دەبوو کاتێ کە ئەم بەلگەیەکی لە سوننەت دەهێنایەوە و ئەویش دەی وت : ئایا کار بەو بەلگەیە دەکەیت ؟.

زەعفەرانیی ئەلێت : گوێم لە شافیعیی بوو ، بەوکەسەی کە لێی دەپرسیی : ئایا کار بەم فەرموودەیە دەکەیت ؟ ، دەی فەرموو : « بۆچ وا دەزانی من لە پەرستگای جوولەکاندام ؟ وا دەزانی لە کلیسای گاوراندام ؟ وا دەزانی جل و بەرگی کافرانم

---

[١٧٢] ئەم ئایەتە پیرۆزە دەری دەبڕێ کە قورئانی پیرۆز ناتەواویی و کەم و کورتیی تێدا نیە لەبەر ئەوەیە فەرمایشتی خوای گەورەیە . واتە هەرچیی نووسراو هەیە دەبێ کەم و کورتیی و هەلەی تێدا بێ ، چونکە نووسراوی دەستی غەیری خوایە .

[١٧٣] توالي التأسيس ( ٦٢ ) .

[١٧٤] معجم الأدباء ( ١٧ : ٢٩٥ ) .

لەبەردایە ؟ دەمبینی لە مزگەوتی موسڵمانان دام و ، جل و بەرگی موسڵمانانم لەبەردایە و ، رووم لە قیبلەی ئەوانە و ، فەرموودەش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕمەوە ، دوای ئەوەش بەگوێی نەکەم ؟ » .[175]

هەتا ئەوەندە وابەستەی سوننەت بوو ، کە سوننەتێکی دەکردە بەڵگە و پێی بوترایە : ئەوە بەگوێی دەکەی ؟ ، لەرزی لێ دەهات و رەنگی زەرد هەڵ دەگەڕا . لە رەبیعی کوڕی سولەیمانەوە دەگێڕنەوە وتوویە : لە کاتێکدا کە پیاوێک پرسیارێکی لە شافیعیی دەکرد ، گوێم لێی بوو کە دەیفەرموو : لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە وەها و وەهای فەرمووە.. پرسیارکەرەکە پێی وت : ئەوە کار بەوە دەکەیت ؟ شافیعیی لەرزی لێهات و ، رەنگی زەرد هەڵگەڕا و ، حاڵی گۆڕا و فەرمووی : « تیاچیت ! چ زەوییەک دەمگرێتە خۆ و ، چ ئاسمانێک لە ژێریدا جێم دەکاتەوە ئەگەر فەرموودەیەک لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بگێڕمەوە و ، کاریشی پێ نەکەم ؟ بەڵێ ، بەسەر سەرو بە چاوان » .[176]

شافیعیی کە هەندێکی دەدیی بە کوێرانە شوێن خەڵکیی دەکەون ، لە هەمان کاتیشدا کە فەرموودەیەکی رێک و پێکی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینن کە هیچ پێچ و پەنایەکی تێدا نیە ، دەبنە کۆسپ و ناهێڵن خەڵک شوێنی ئەو سوننەتە بکەون ، زۆر بێتاقەت دەبوو .

جارێکیان لەو بارەوە فەرمووی : « بۆ هیچ کەس رەوا نیە لە بارەی دەست بەرزکردنەوەی کاتی سەرەتای نوێژ و ، لە کاتی رکووع و ، لە رکووع سەر بەرزکردنەوەدا ، فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ببیستێ ، کەچیی چاو لەو کردارەی پێغەمبەر ﷺ نەکات » .[177]

ئیمام شافیعیی هەر بە منداڵیی رای لەسەر شوێنکەوتنی سوننەت بووە ، هەر ئەو کاتەی کە لە مەککەدا خەریکی دەرس خوێندن بوو .

موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی جەوهەریی دەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لە خزمەتیسوفیانی کوڕی عویەینەدا بووم ، پێیان وت : گەنجێک هاتووە ـ مەبەستیان لە ئیمام شافیعیی بووە ـ ئەڵێت : « شوێن فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەون و ، واز لە ( رأي ) بهێنن » . سوفیان وتی : خوا پاداشتی ئەو گەنجە بە چاکە بداتەوە .. پاشان

---

[175] طبقات الشافعية ( ٢ : ١٣٨ ) .
[176] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١١ ) و صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٥ ) .
[177] الطبقات الكبرى ( ٢: ١٠٠ ) .

وتی: خوای گەورە فەرموویە : ﴿ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴾ ( الأنبياء : ٦٠ ) ، هەروەها فەرموویە : ﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾ ( الكهف : ١٣ ) [١٧٨].

هەر لەو بارەوە زانایان و پیاوچاکان چەندین خەویان بە پێغەمبەری خواوە ﷺ بینیوە کە پشتگیریی لە شافیعیی و را و بۆچوونەکانی کردووە ، کە بەرگریی لە سوننەت کردووە و دژی بیدعەتیش وەستاوە [١٧٩].

## ( ٣ ) فیقهی شافیعیی :

ئەوە بوو پێش ئەوەی شافیعیی دەست بداتە بڵاوکردنەوەی زانستەکەی ، زانایان بوو بوونە دوو دەستە بۆ ئەوەی حوکمە شەرعیەکان بە خەڵک بگەیەنن : دەستەیەکیان فیقهیان بەدەست هێنا بوو بەڵام فەرموودە بە لایانەوە لە پێش بوو ، وەک سوفیانی ثەوریی و ، کوڕی عویەینە و ، مالیک و ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل . دەستەیەکیش شارەزای فەرموودە بوون بەڵام ( رأي ) واتە قیاس بە لایانەوە پێش دەخرا ، وەک نەخەعیی و ، حەمماد و ، ربيعة الرأي و ، ئەبوحەنیفە .

کە شافیعیی هاتە مەیدانەوە زانستی هەردوو لای وەرگرت .. لە فەرموودەش و لە قیاسیش تەواو شارەزا بوو .. پاشان دەستی دایە ئیجتیهاد و ( اصول ) ی فیقهی دانان .. یاسا و دەستوورەکانی دارشتن .. بەمە بووە خاوەنی قوتابخانەی سێهەم .. قوتابخانەیەک لە نێوان هەردوو قوتابخانەکەدا .

واتە بە جوانیی دەستی بە سوننەتەوە گرت و لە هەمان کاتیشدا ئەوەی کە راست و گونجاو بوو لە قیاسدا ئەویشی وەرگرت . بۆ ئەمە ئیمام ئەحمەد ئاماژەیەکی جوانی هەیە کە فەرموویە : ( ما زلنا نلعن أهل الرأي ويلعنوننا حتى جاء الشافعي فمزج بيننا ) . [١٨٠]

قاضيی عیاض ئەم فەرمایشتەی ئیمام ئەحمەد روون دەکاتەوە کە مەبەستی ئەوە بووە شافیعیی دەستی بە فەرموودەی صەحیحەوە گرتووە و پیشانیشی داون کە هەندێ لە قیاسیش پێویستە و حوکمی شەرعیی لێ دەردەهێنرێت .. واتە بە فەرموودە ناسانی گەیاند کە ( رأي ) راست ( فرع ) ی ( اصول )ە و ، بە ئەهلی ( رأي )شی گەیاند کە

---

[١٧٨] الانتقاء ( ٧١ ) .

[١٧٩] الوافي بالوفيات (٢ : ١٧٦ ) ، آداب الشافعي ( ٧٢ ) .

[١٨٠] ترتيب المدارك ( ١ : ٩٥ ) .

پێویسته سوننەتی صەحیح پێش هەموو شتێک بخرێت ، ئەوسا دوای ( اصل ) شوێن ( فرع ) یش بکەون .[181]

زانایانی پێش شافیعیی بە شێوەیەکی سادە هەندێ مەسئەلەی ئوصوولی فیقهیان بەکار دەهێنا ، بەڵام یاسایەکی گشتییان بە دەستەوە نەبوو تا بۆ زانینی شەریعەت بگەڕێنەوە سەری و بەکاری بهێنن . جا کە شافیعیی هاتە مەیدانەوە زانستی ( اصول )ی فیقهی دەرهێنا و ، یاسایەکی گشتیی بۆ موسڵمانان نەخشە کێشا تا بۆ زانینی پلەکانی بەڵگە شەرعییەکان بگەڕێنەوە سەری .[182]

ئەوە بوو لە عیلمی أصول دا کتێبی ( الرسالة ) و ( أحكام القرآن ) و ( إختلاف الحديث ) و ( إبطال الإستحسان ) و ( جماع العلم ) و ( القياس ) ی دانا و ،[183] هەرخۆیشی یەکەم کەس بوو کە فەرموودەی ناسخ و مەنسووخی جیا کردەوە ، وەک ئەسنەویی دەری بڕیوە .

دەبیس ئەڵێت : هاتمە لای حوسەین ـ واتەکەرابیسیی ـ و وتم : دەربارەی شافیعیی چیی ئەڵێیت ؟ وتی: چیی بڵێم لە بارەی پیاوێکەوە کە : قورئان و سوننەت و یەکخستنی موسڵمانانی خستە سەر زمانی خەڵکیی ؟! نە ئێمە و نە پێشینانیش نەمان دەزانی قورئان و سوننەت چین ، هەتا شافیعیی هات و لەوەوە : قورئان و سوننەت و ئیجماعمان بیستن .[184]

موحەممەدی کوڕی موسلیم ی کوڕی وارە ئەڵێت : کاتێک لە میصرەوە هاتم ، چووم بۆ لای ئەبوعەبدوڵلا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل تا سەلامی لێ بکەم ، پێمی فەرموو : کتێبەکانی شافیعییت نووسیونەتەوە ؟ وتم : نەخێر . پێمی فەرموو : « دەی کەمتەرخەمییت کردووە ! تا نەچووینە خزمەتی شافیعیی نە عموم و خصووصمان دەزانی و ، نە ناسیخ و مەنسوخی فەرموودەی پێغەمبەری خوامان ﷺ جیا دەکردنەوە » .[185]

جا لە پێشەوە باس کرا کە هۆی نووسینی کتێبی ( الرسالة ) لە ئوصوولی فیقهـ دا ، نامەیەکی پێشەوای فەرموودەناسانی چەرخی خۆی ، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدیی بوو ، لە عێراقەوە ، کە بۆ شافیعیی ـ کە هێشتا گەنج بوو ـ نارد ، کە تیایا داوای لێ کردبوو

---

[181] ترتيب المدارك ( ١ : ٩٥ ) .
[182] مناقب الشافعي ( ٥٧ ) .
[183] مقدمة الرسالة ( ١٣ ) ، وفيات الأعيان ( ١ : ٥٦٦ ) .
[184] آداب الشافعي ( ٥٧ ) .
[185] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١٣ ) وانظر الحلية ( ٩ : ٩٧).

کتێبێـک لـه بـارەی مـەعانیی قورئـان و دەرخسـتنی ناسـیخ و مەنسـووخی قورئـان و سوننەتەوە دابنێ بۆی .[١٨٦] ئەویش ( الرسالة ) ی دانا و بە حـــاریثی کـوڕی سورەیجی نەققالدا بۆی ڕەوانە کرد و ، هەر بەو بۆنەشەوە بوو کە نازناوی ( نەققال ) ی بەسەردا بڕرا

ئەمە داوای پێشەوایەکی تاقانەی عیراقە لە شافیعیی کە هێشتا وا لە تـافی لاویـدا .. کـاتێکیش کە کتێبەکە گـەیشتە دەست کوڕی مـەهدیی بەسـەر سوڕمـانەوە دەی وت : ( لو کان اقل لنفهم ! لو کان اقل لنفهم ) .[١٨٧] ئاوات دەخوازێ کتێبەکە کـورتتـر بوایـە تا چاکتر لێی تێ بگەیشتایە ! هەروەها دەیوت : « کاتێ کـە سـەرنجی ( الرسـالة )ی شافیعیم دا سەرسامی کـردم ، چونکـە دەبینـم فەرمایشـتی پیـاوێکی ژیـری زمانپـاراوی ئامۆژگارە.. بە ڕاستیی هەردەم دوعای خێری بۆ دەکەم » .[١٨٨]

هەروەها دەی وت : « وا پێ نازانم کە خوا وەک ئەم پیاوەی بەدیی هێنا بێ » .[١٨٩]

نەک هەر کوڕی مەهدیی بە ( الرسالة ) سەرسام بووبێ ، بەڵکو زۆرێک لە کەڵەزانایان یەکجار سەرسام بوون و بە چاوی ڕێزەوە تەماشایان دەکرد ..

موزەنیی وتوویە : ( الرسالة ) م پێنج صەد جـار خوێندۆتـەوە و ، هـەموو جـارێکیش کەڵکی تازەم لێ وەرگتووە . لە ڕیوایەتێکی تریشدا وتوویە : پەنجا ساڵ دەبێت (الرسالة) دەخوێنمەوە و ، پێش نازانم جارێک خوێندبێتمەوە و کـەڵکی شـتێکم لێ وەرنـەگرتبێ کـە لەوە و پێش نەمزانی بێ .[١٩٠]

یـەحیـای کـوڕی سـەعیدی قەططـانیش ، کـە فەرموودەی زۆری لەبەر بووە و ( ثقـة ) و ( حجة ) بووە و لە ساڵی ١٩٨ دا کۆچی دوایی کردووە ، کاتێک کە کتێبی ( الرسالة ) ی پیشان دەدرێت ، ئەڵێت : لە شافیعیی ژیرتر یان فەقیهـ ترم نەدیوە .[١٩١]

لەو سەردەمەدا زۆربەی زانایان دەستیان دابـووە کۆکردنـەوە و لەبـەرکردنی فـەرموودە ، بێئەوەی توانای تێگەیشتنیان هەبێ لە مەبەستی فەرموودەکان ..

---

[١٨٦] تاريخ بغداد ( ٢: ٦٤ ) والمجموع ( ١: ١٦ ).

[١٨٧] طبقات الشافعية ( ٢ : ١١٢ ) .

[١٨٨] توالي التأسيس ( ٥٥ ) .

[١٨٩] مرآة الجنان ( ٢ : ١٨ ) .

[١٩٠] المجموع ( ١ : ١٦ ) .

[١٩١] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٩ ) .

عەبدولمەلیکی مەیموونیی ئەڵێت : ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پێمی فـەرموو : جگـە لـە کتێبی شافیعیی سەیری کتێبی هیچ کەسێکی ترم نەکردووە کە کتێبی فیقهی نووسیی بێ. هەروەها پێمی فەرموو : بۆچیی سەیری ئەو کتێبانە ناکەیت ؟ و باسی کتێبی ( الرسـالة ) ی بۆ کردم و پێش هەموو کتێبەکانی خست ..

جا عەبدولمەلیک دەری دەبڕێ کە ئەو شیاوی خوێندنەوەی ئـەو کتێبانـە نیـیە ، چونکـە هـەر خەریکی کۆکردنەوە و ریوایەت کردنی فەرموودەیە و ، توانای نیە لێیان تێ بگات ..[١٩٢]

ئەمـــەش ئـەو فەرموودەیـەی شـافیعییمان وە بـیر دێنێتـەوە کـە بـە ئیبن مقلاصـی فـەرمـوو : « ئەبو عـەلیی ! دەتەوێ فەرموودە لەبەر بکەیت و ببیتە فەقیهـ ؟ هەی هـات ، لەوەوە چەند دووری ؟! » .[١٩٣]

نەک هەر تەنها ئەبوعەلیی ، بەڵکو بەشێکی گەنجی خوێـنگـەرمی ئـەمڕۆ بـێ ئـەوەی شارەزایەکی ئەوتۆشیان لە زمانی عەرەبیی‌دا هەبێ ، دەیانەوێ خۆیان ببنە فەقیهـ و حوکم لە فەرموودەکان دەربهێنن ، بۆیە بە پێویستی نازانن گوێ لە ئیمامە موجتەهیدەکان بگـرن و ، هەندێکیشیان لە بارەی فیقهەوە کتێـب دادەنێـن . هـەر ئـەوە نیـە فـەرموودە بـهێنن و بی‌کەنە بەڵگەی بۆچوونەکانیان ؟!

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی ترەوە ئیمام شافیعیی و هەموو ئیمامێکی تریـش رازیـی نەبوون هیچ کەس بە کوێرانە شـوێنیان بکـەوێ ، چونکـە شـەریعەت ئـەوەی پـێ باشـە کـە هەموو کەسێ هەوڵ بدات بگاتە پلەی ئیجتیهاد تا هەموو کەسێک بە چاوساغی‌یەوە و بـە دەلیلی رێک و پێکـەوە قەناعـەت بـە حوکمـە شـەرعی‌یەکان بکـات . بـەڵام چـار چی‌یـە ؟ هەموو ئادەمی‌یەک خاوەنی ئەو زیرەکی‌یە نیە تا بتوانێ بگاتە پلەی ئیجتیهاد .. هـەروەها لەناو زیرەکانیش‌دا هـەموو کەسـێ توانـای نیـە لێ ببڕێ بـۆ ئـەو باسـە و ، بـە کاروبـار و پێویستیی تری ژیانەوە پەشۆکاوە ، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە هـەندێک بـە لێ‌هـاتنی چاکـەوە لێ‌ببڕێن و ، ببنە پسپۆڕی ئەو بابەتە و موسڵمانانیش دوای تاقیی‌کردنـەوە و پـەیدا کردنـی متمانە شوێن راکانیان بکەون ، هەروەک لە هەموو زانستێک‌دا کۆمەڵێک دەبنە پسپۆڕ و چاوساغیی خەڵکەکە دەکەن .

کەواتە چار نیە و پێویستە هەندێک تەقلید بکەن ، چونکە لــە هـەموو کۆمەڵگایـەک‌دا بەشێکی زۆری خـەڵک توانـای گەیشـتن بـە پلـەی ئیجتیـهادی نیـە ، هـەتا لـە سـەردەمی

---

[١٩٢] آداب الشافعي .

[١٩٣] الإمام الشافعي ( عبدالغني الدقر ( ٢٣١ ) .

هاوەڵان و تابیعیندا ، زۆربــەی هـاوەڵان و تابیعیـیانیش فـەتوایان نەئـەدا و ، گوێیـان بـۆ فەتوای ئەهلی عیلم دەگرت .

بەڵام ئەم تەقلیدکردنە مەرجێکی زۆر گرنگی لەگەڵدایــە کـە پێویسـتە ئـەو موسـڵمانە تەقلیدکـەرە بـە جـەزم و بـە یـەقینیی عـەقیدەی وەهـا بـێ کـە تەنــها خـوای گــەورە و پێغـەمبــەرەکەی بۆیـان هەیـە شـەریعەت بڕیـار بـدەن و ، هیـچ موجتـەهیدێک ـ لـە هـەر پلەیەکدا بێت ـ نابێتە ( حجــة ) و دەگونجـێ وتـەی لێ وەربگـیرێ و هەندێکیشـی لێ بدرێتە دواوە .. ئیتر کاری موجتەهید ئەوەیە بەوپەڕی دەسـت پـاکیی و ئەمانەتـەوە دینـی خوا بە خەڵک بگەیەنن و هەردەم ئەوەش بۆ خەڵک دووبارە بکەنەوە کە ئـەوان بەندەیـەکی پڕقسووری خوای گەورەن .

نا لێرەدا و لە وەرگرتنی ئەم مەرجەدا هەندێ گەنجی خوێنگەرم سەریان لێ دەشـێوێ ، یان سەریان لێ دەشێوێنن و ، ئـەڵێن : ئیمامـەکان مـەعصووم نـین و هەڵـەیان لـە دەست دەردەچـێ . بەمـە خۆیـان لـە گوێڕایـەڵیی ئیمامـانی مەزهەبـەکانی ئیسـلام دادەمــاڵن و مەعصوومییەت دەکەنە خەڵاتی ئەو کەسەی کە ئـەمڕۆ بـە گوێـی دەکـەن ، یـان دوو سـێ لاپەڕە فیقهی کۆ کردۆتەوە ..

کورتەکـەی ئیمامــەکان هــەر هــەموویان ، بـە تایبـەت چـوار ئیمــامی خــاوەنی چــوار مەزهەبەکە ، بە توندیی دژی تەقلید کردنن ، بۆ ئەوەی هەموو کەسێ بە پێی تێگەیشـتنی خۆی لە بەڵگەکان شارەزا ببێ ، تا دڵی لە متمانە پڕ بێت .. هەتا نزیک ترین قوتابیی ئــەو ئیمامانــە جاری وا بــووە ـ چ لـە ژیـانی مامۆسـتاکەیاندا و چ لـە دوای مردنیشـیان ـ رای پێچەوانەیان دەربڕیوە و فەتوای پێچەوانەیان داوە ، بە بۆنەی ئەوەوە کە بڕوایان وەها بــووە خـوای گـەورە فـەرمانی نـەداوە بـەندەکان هیـچ بەندەیـەکی تـر بپەرسـتن .. بـەڵکو تەنــها فەرمایشت لە خوا وەردەگیرێ و پاشانیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئیـتر لـەوان بـەو لاوە ، موسڵمان بۆی هەیە لە هەموو کەسێ حوکم وەربگرێ و دەشتوانێ بیداتە دواوە ..

## ( ٤ ) بەرابەرکێ :

ئەو سەردەمە وەها باو بووە کە زانایان کۆڕ ببەستن و ، هەرکەسە بەڵگەی خۆی بخاتــە روو تا دەربکـەوێ کـێ زیـاتر لـە حـەق گەیشـتووە ، بەمـە کەڵـەزانایان دەردەکـەوتن و بـە زانستی فراوانیان موسڵمانانیان لە ئیسلام شارەزا دەکرد ..

لەسەردەمی ئیمام شافیعیی‌دا تاقە کەسێک نەبووە ئەوەندەی ئیمـام شـافیعیی توانـای ،رابەرکێی هەبێ ، لەبەر ئەوەی کە خاوەنی زیرەکیی بێ‌وێنە و، وەڵامی خێرا و، بەڵگـەی ،ئامادەبوو و، کەم وکورتیی بەڵگەی بەرامبەری خێرا دەدۆزی‌یەوە و، روونکردنـەوەی وەهـا ،هێز بوو کەس توانای بەرهەڵستیی نەبوو و ، خاوەنی سامانێکی فراوانی وتـە و دارشـتن ،و و ، لە کاتی وت و وێژدا دامەزراو بوو و ، چاویشی دەبڕی‌یە بەرامبەرەکەی ..

هـاروونی کـوڕی سـەعید باسـی توانـای بێ‌وێنـەی شـافیعیی دەکـات لـە وت و وێـژدا و ،ەڵێت: ئەگەر شافیعیی بەرابەرکێ لەسەر ئەوە بکات کە ئەم کۆڵەکەیە کە لە بەرد دروسـت ،راوە لە دار دروست کراوە ، ئەوا بە بۆنەی توانا و لێ‌هاتنیەوە سەردەکەوێ .[١٩٤]

لێ‌هاتنی شافیعیی بە رادەیەک بووە خەڵکیی بەزەیی‌یان بە بەرامبەرەکەی‌دا هاتۆتـەوە. ،وحەمـەدی کوڕی عـەبدوڵڵای کوڕی عـەبدولحەکـەم وتوویـە : « هەرکەسـم دیی‌بـێ لەگـەڵ شافیعیی‌دا بەرابەرکێی کردبێ بەزەییم پیای‌دا هاتۆتەوە . خۆ ئەگەر چاوم لێ‌بوایە شافیعیی بەرابـەرکێت لەگـەڵدا بکـات وام دەزانـی شـێرێکە و دەت‌خـوا . هـەر ئـەویش بەڵگـەکانی بیشانی خەڵکیی دا ».[١٩٥]

رەبیع‌یش بە موزەنیی ئەڵێ : « ئەگەر شافیعیی بەرابـەرکێ لەگـەڵ شـەیتان‌دا بکـا لێمی دەباتەوە و دەی‌دا بە زەویی‌دا » .[١٩٦]

هەتا لەگەڵ کەڵەزانایانیش هەر هەمان توانای هەبووە .

کاتێک کە شافیعیی هاتە بەغداد ، مامۆستای قوتابخانەی ( الـرأي ) موحەمـمـەدی کوڕی حەسەن بوو کە هاوەڵی ئیمام ئەبوحەنیفە بوو و ، مامۆستای شـافیعیی خـۆی بـوو .. هەرکاتێک موحەممەد بڕۆیشتایە شافیعیی لەگـەڵ قوتابیـەکانی‌دا موناقەشـەی دەکـرد .. جارێکیان ویستی لەگەڵ شافیعیی‌دا بەرابەرکێ بکات ، بەڵام شافیعیی رێـزی لێ دەگـرت و حەزی نەدەکرد . بەڵام موحەممەدی کوڕی حەسەن کۆڵـی نـەدا و بـە زۆر شـافیعیی ناچـاری بەرابەرکێ کرد . کە وت و وێژ گەرم بوو ناڕەحەتیی و شڵەژاویی روویان لە موحەممەد کـرد بە رادەیەک کە هەموو گیـانی ئاوسـا و قۆپچـەکانی یـەک لـە دوای یـەک دەپچـڕان ، وەک شافیعیی خۆی دەی‌گێڕێتەوە .[١٩٧]

---

[١٩٤] توالي التأسيس ( ٥٩ ) .
[١٩٥] الوافي بالوفيات ( ٢ : ١٧٣ ) وتوالي التأسيس ( ٦٠ ) .
[١٩٦] الوافي بالوفيات ( ٢ : ١٥ ) .
[١٩٧] آداب الشافعي ( ١٦٠ ) .

لەگەڵ ئەم هەمووە توانایەدا شافیعیی زۆر بەحیلم بووە و ، لە کاتی وت و وێژدا دەنگی بەرز نەکردۆتەوە ، چونکە تەواو متمانەی بە خۆی بووە و ، بەڵگەکانی نەدەدرانـە دواوە.[198]

هەتا ئەوەندە بەحیلم بووە ئەگـەر قوتابیان و کـەمتەمەنـەکان نـەزانگۆیی‌یـان کردبـێ لێـی نەگرتوون . رۆژێکیان شافیعیی لە ئەڵقەی دەرس وتنەوەکەیدا دادەنیشێ و ، منداڵێکی کەم تەمەنیش دێت و پرسیارێکی لێدەکات . شافیعییش وەڵامــی دەداتــەوە . پاشـان پرسـیاری تری لێ دەکـات و دوای وەڵام دانـەوە ئـەڵێت : هەڵــەت کــرد . شــافیعیی بــە منداڵەکـە ئەفەرموێ : « کوڕی برام ! لە چاو ئەوەدا کە لە کتێبەکەت نووسراوە هەڵەم کردوەو ، بەڵام لە چاو حەقدا نەء » .[199]

جا ئیمام شافیعیی لەم بەرابەرکێیەدا مەبەستی ئـەوە نـەبوو بەرامبـەرەکـەی ببـەزێنێ ، بەڵکو دەیویست هیدایەتی بدات و حەقی پێ بناسێنێ ..

حوسـەینی کـوڕی عـەلیی کەرابیسیی ئەڵێت : لە شافیعییم بیستووە کە دەیفـەرمــوو : « لەگەڵ هەرکەسێکدا بەرابەرکێم کردبێ پێم خۆش بووە سەرکەوتوو بێ ، یـان ڕێـی ڕاسـت بگرێتە بەر ، یان یارمەتیی بدرێت و ، لەلایــەن خـواوە پارێزگـاریی و چـاودێریی بکرێـت . هەروەها لەگەڵ هەرکەسێکدا بەرابەرکێم کردبێ باکم نەبووە لەوەی کە خـوا حـەقی لەسـەر زمانی من یان زمانی ئەو کەسە دەرخستبێ » .[200]

ئەحمەدی کوڕی خـالیـدی خەلالیش ئـەڵێت : لە شـافیعییم بیستووە کە دەیفــەرمـوو : « لــەگـەڵ هیــچ کەسێکدا بــەرابەرکێم نەکــردووە و پێــم خــۆش بووبــێ ڕاکـانی بــە هەڵــە دەرچــن » [201] . هــەروەها دەیفــەرمـوو : « بــۆ بردنــەوە لــەگەڵ هیــچ کەسـێکدا بەرابـەرکێم نەکردووە » [202] . بەڵکو بۆ ئامۆژگاریی و تێگەیاندن . ئەفەرموێ : « بۆ ئامۆژگاریی نــەبێت هەرگیز لەگەڵ هیچ کەسێکدا بەرابــەرکێم نــەکردووە » [203] بەمــەش مەبەستی هیدایــەت و ڕێپیشاندان بووە بە ئیخلاصەوە ..

---

[198] تهذيب الأسماء واللغات ( ٦٦ ) .

[199] توالي التأسيس ( ٦٤ ) .

[200] توالي التأسيس ( ٦٥ ) .

[201] توالي التأسيس ( ٦٥ ) .

[202] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٦ ) .

[203] توالي التأسيس ( ٦٥ ) .

ئەی داخۆ شافیعیی بە چ چاوێکەوە سەیری بەرامبـەرەکانی کردبێ ؟ ڕێـز و پایـەدانانی شافیعیی بۆ بەرامبەرەکەی بۆ زۆریـی زانسـت و ، دەنگـی بـەرز و ، لێهاتنیـەوە نـەبووە بەڵکو ئەو کەسە ویژدانی چەندە بووبێ بۆ وەرگرتنـی حـەق.. تـا چ رادەیـەک نەفسـی خـۆی مل‌کەچ کردبێ بۆ وەرگرتنی بەڵگە و دەلیـل . ئـەوەبوو ئەیفـەرموو : « بەڵگـەم خسـتبێتە پێش چـاوی هەرکـەس و وەری‌گرتبـێ ، لـە بـەر چـاومدا مـەزن بـووە و ، هـەر کەسـیش بەڵگەکەمی دابێتە دواوە لەبەر چاوم کەوتووە ».[٢٠٤]

ئێستەش وا چاکە چەند نموونەیـەک لـە بەرابـەرکێکانی شـافیعیی بخەینـە بەردەسـتی نازیزان ، بەلاّم لە شوێنێکی ئاوەها بچووکدا ماوەی خستنەڕووی هەموو وت و وێژەکـانی نابێت ، بەڵکو دەتوانن سەرنجی نووسراوەکانی بگرن بە تایبەت ( الرسالة ) و ( اختـلاف الحديث ) و ( الأم ) کە پڕن لەو بابەتانە

یـەکێ لـەو بەرابەرکێیانـە ئەوەیـە کـە دەگێڕنـەوە جارێکیـان ئیمـام ئەحمـەد و ئیمـام شافیعیی لەسەر وازهێنان لە نوێژ دەکەونە بەرابەرکێ . شافیعیی ئەفەرموێ :

ئەحمەد ! ئایا ئەڵێی : کافر دەبێت ؟

ئەحمەد ئەفەرموێ : بەڵێ .

شافیعیی ئەفەرموێ : ئەگەر کابرا کافر بێت بە چیی موسڵمان دەبێت ؟

ئەحمەد ئەفەرموێ : بڵێ : لا إله إلا الله محمد رسول الله

شافیعیی ئەفەرموێ : دەی کابرا لەسەر ئەم وتەیە بەردەوامە و وازی لێناهێنێ

ئەحمەد ئەفەرموێ : نوێژ بکات ئەوسا موسڵمان دەبێ

شافیعیی ئەفەرموێ : نوێژی کافر دروست نیە ، بە نوێژ کردنیش حوکمی موسڵمان بوون نادرێت .

بەمە ئیمام ئەحمەد کۆڵی دا و بێدەنگ بوو .[٢٠٥]

هەروەها لەگەڵ موحەممەدی کوڕی حەسەندا بەرابەرکێی زۆری هەن ، کە یـەکێ لەوانـە ئـەم بەرابەرکێیـە کـە عـەبدوڵلای کـوڕی زوبـەیری کـوڕی عیسـای قوڕەیشـیی حومـەیدیی دەیگێڕێتەوە ، ئەڵێت : شافیعیی فەرموویە

---

[٢٠٤] توالي التأسيس ( ٦٤ ) .

[٢٠٥] طبقات الشافعية ( ٢ : ٦١ ) .

کتێبەکانی موحەممەدی کوڕی حەسەنم نووسینەوە و شارەزای وتەکانیان بووم ، کە ئەو هەڵ دەستا و دەڕۆیشت لەگەڵ قوتابیەکانیدا بەرابەرکێمان دەکرد . ڕۆژێکیان بە تووڕەییەوە پێمی وت : پێم گەیشتووە کە تۆ پێچەوانەی ئێمە دەجووڵێیتەوە . منیش وتم: ئەوە بۆ وت و وێژ و بەرابەرکێیە . وتی : شتی ترم پێ گەیشتووە . وەرە لەگەڵ مندا بەرابەرکێ بکە . وتم : بە مەزنت دەزانم و لە بەرابەرکێش بەرزترت دەزانم . وتی : هەردەبێ بیکەیت . کە کۆڵی نەدا وتم : دەی وەرە . وتی : لە بارەی پیاوێکەوە رات چییە کە تەختەساجێکی پیاوێکی تری داگیر کردبێ و بینایەکی لەسەر دروست کردبێ کە هەزار دیناری تێچووبێ و ، پاشان خاوەن ساجەکە هاتبێ و ، بە دوو شاهێدی عەدل سەلماندبێتی کە ئەم ساجەی لێ داگیر کردووە و ، ئەم بینایەی لەسەر دروست کردووە ، چۆن حوکمی ئەوە دەدەی ؟

وتم : بە خاوەنی ساجەکە ئەڵێم : بۆت هەیە نرخی ساجەکە وەربگریت ، ئەگەر رازیی بوو ، حوکمی ئەوەی بۆ دەردەکەم کە نرخەکەی بدرێتێ ، ئەگەر رازییش نەبوو و هەر ساجەکەی خۆی ویست ئەوا بیناکە دەڕووخێنم و ساجەکەی بۆ دەگێڕمەوە .

دوای ئەوە لێمی پرسیی : لە بارەی پیاوێکەوە رات چییە کە تاڵە دەزوویەکی ئاوریشمی لە پیاوێکی تر داگیر کردبێ و سکی خۆی پێ دووریبێتەوە . پاشان خاوەنی تاڵە دەزووەکە هاتبێ و بە دوو شاهێدی عەدل سەلماندبێتی کە : ئەم پیاوە ئەم تاڵە دەزووەی لەو داگیر کردووە و ، سکی خۆی پێ دووریوەتەوە . ئایا تاڵە دەزووەکە لە سکی دەکەیتەوە ؟

وتم : نەخێر .

موحەممەد وتی : الله أكبر ، وازت لە وتەی خۆت هێنا . هاوەڵانیشی وتیان : وازت لە وتەی خۆت هێنا . ( واتە : بۆ ساجەکە رایەکت هەبوو و ، بۆ تاڵە دەزووەکەش رایەکێ ) .

وتم : پەلە مەکەن . هەواڵم بدەنێ ، ئەگەر ئەو پیاوە ساجەکەی لە هیچ کەسێ داگیر نەکردایە و حەڵاڵی خۆی بوایە و بیویستایە ئەو بینایە بڕووخێنێ و ساجەکە دەربهێنێ و بینایەکی‌تر دروست بکات ، ئایا ئەوە موباحە بۆی ، یان حەرامە بۆی ؟

وتیان : بۆی موباحە .

وتم : ئەی ئەگەر دەزووەکە دەزووی خۆی بێت و ، بیەوێ ئەم دەزووە لە سکی بکاتەوە، ئایا ئەوەی بۆ موباحە ، یان بۆی حەرامە ؟

وتیان : حەرامە .

وتم : جا چۆن قیاسی موباحێک لەسەر حەرامێک دەکەی ؟

پاشان وتی: ئەگەر پیاوێک تەختەساجێک لە پیاوێکی تر داگیر بکات و بۆ چاککردنی کەشتی‌یەکەی بەکاری بهێنێ و ، کەشتی‌یەکەشی بردە ناو دەریاوە و ، خاوەنی ساجەکە بە دوو شاهێدی عەدل سەلماندی کە : ئەو پیاوە ئەم پارچە ساجەی لێ‌داگیر کردووە و لە کەشتی‌یەکەی‌دا بەکاری هێناوە ، ئایا ئەو تەختەیە لە کەشتی‌یەکە دەکەیتەوە ؟ « واتە لە ناو دەریاکەدا کون دەکەیتە کەشتی‌یەکەوە و خەڵکیشی تێدا بێ ؟ » .

وتم : نەخێر .

وتی : الله أكبر ! وازت لە وتەی خۆت هێنا ! هاوەڵەکانیشی وتیان : وازت لە وتەی خۆت هێنا .

وتم : ئەگەر ئەو کەشتی‌یەوانە ئەو تەختە ساجە هی خۆی بێت و ، بیەوێ لە کەشتی‌یەکەی بکاتەوە ـ لەو کاتەدا کە لە ناوەڕاستی دەریادایە ـ ئایا ئەوەی بۆ موباحە ، یان حەرامە ؟

وتی : بۆی حەرامە . ( واتە دەبێتە مایەی خنکانی کەشتیی‌سوارەکان ) .

پرسیی : ئەی خاوەن کەشتی‌یەکە چیی بکات ؟

وتم : فەرمانی بەسەردا دەدەم کەشتی‌یەکەی بەرەو نزیکترین بەندەر بەرێت ، تا بە شێوەیەک لەنگەر بگرێت نە خۆی و نە هاوەڵانی تیا نەچن . پاشان تەختەکەی لێ دەکەمەوە و ، دەی‌دەمەوە دەست خاوەنی و ، بەویش ئەڵێم : کەشتی‌یەکەت چاک بکە و برۆ .

وەکو بەڵگە هێنانەوەیەک موحەممەدی کوڕی حەسەن وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەی‌فەرمووە : « لا ضرر ولا ضرار »[٢٠٦] ؟

وتم : خۆی زیانی بە خۆی گەیاندووە . کەس زیانی بەو نەگەیاندووە .

شتێکی‌تری خۆش لە بارەی بەرابەرکێی شافیعی‌یەوە دەگێڕنەوە کە جارێکیان لەگەڵ ئەبوعوبەید ـ کە قاسم ی کوڕی سەللامە ـ لەسەر مانای ( قرء ) لە قورئاندا بەرابەرکێ دەکەن . جا وشەی ( قرء ) لەو وشانەیە کە دژە مانای هەیە . واتای حەیز و پاک بوونەوەش لە حەیز دەگەیەنێ . هەردووکیان ئەوەندە بەڵگەی بە هێزیان لەسەر بۆچوونەکەیان دەهێنایەوە ، کاتێک کە دەستیان هەڵ گرت ، هەریەکەیان چووبووە سەر را

---

[٢٠٦] لە زۆربەی سەرچاوەکاندا « ضرر » هاتووە .

و بۆچوونـی ئـەوی تریـان و ، بەڵگـەکان کاریـان کردبـووە سـەری .. ئەمـەش پایـەداریی ئەبوعوبەید دەگەیەنێ ، چونکە نەبیستراوە شافیعیی لەگەڵ کەسێک بەرابەرکێی کردبێ و ، چووبێتە سەر مەزهەب و بۆچوونی ئەو کەسە ، وەک سوبوکیی ئەڵێت .

## ( ٥ ) زانستی کەلام :

کە کۆمەڵی موسڵمانان بەرپا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی خـەمخۆری هـەموو گـیر و گرفتێکیان بوو . موسڵمانەکانیش یەک پارچە دژی دوژمنانیان دەوەسـتان و ، لـە خزمـەتی پێغەمبەری ئازیزدا لە فیقهی ئیسـلام شـارەزا بووبـوون و ، هـەر کـە شتێکیان لێبگیرایـە دەگەڕانەوە خزمەتی ئەو و ، هەربڕیارێکی بدایە بە دڵ و بـە گیـان وەریـان دەگـرت . دوای کۆچی یەکجاریی پێغەمبەر ﷺ شەیتان تۆوی دووبەرەکیی لە نێوان موسڵمانەکاندا چـاند و ، بە هەموو توانایەکیەوە هەوڵی دا پەرتەوازەیان بکات .. بـەڵام سـۆز و بـەزەیی پـەروەردگار فریایان کەوت و لەسەر هەڵبژاردنی ئەبوبەکر ـ خوا لێی رازیی بێ ـ بـە خەلیفـە بـۆ خۆیـان رێک کەوتن .. بەڵام تۆوی دووبەرەکیی خۆی حەشـار دا هـەتا ئـەوە بـوو لـە دوا سـاڵەکانی خەلافەتی عوثماندا ـ خوا لێی رازیی بێ ـ سەری دەرهێنا و ، موسڵمانان یەکتریزییان نـەما و ، لە سـەردەمی ئیمـامی عـەلییشدا ـ خـوا لێـی رازیـی بـێ ـ نـاکۆکیی پـەرەی سـەند و موسڵمانان دەستیان دایە یەخەی یەکتریی و ، هەرکەسە بەڵگـە و دەلیلـی لەسـەر راسـتیی خۆی و دەستەکەی دەهێنایەوە . تا ئەوە بوو زانایان لە عەقیدەی موسڵمانان دەترسان تێک بچێ ، لەبەر ئەوە زانستی ( کلام ) یان ( اصول الدین )یان بۆ موسڵمانان نووسیی .

بەڵام زۆربەی زۆری زانا بەرزەکانی ئیسلام ـ کە یـەکێکیان شـافیعیی بـوو ، ئاوڕیـان لـە فەلسەفەی بێ سەر و بن نەدایەوە و خەریکی زانستی پاک و بێگەردی شـەریعەت بوون ، تـا دەستە دەستە و چین بە چین رۆڵەی موسڵمانان شارەزا بکەن .. بەمە ئیمامە پایـەدارەکانی ئیسلام لە جیاوازیی گەورەی نێـوان ئیسـلام و فەلسـەفە گەیشـتن و ، شـەریعەتیان نـەکردە پاشکۆی زانستی ناتەواوی ئادەمیزاد ، بەڵکو لە پلەی بـەرزی شـیاوی خـۆیدا دایـاننـا و ، موسڵمانانیان لەسەر خزمەتکردنی شەریعەت راهێنا .

ئیمام شافیعییش پێی باش بوو موسـڵمانان واز لـە ( کـلام ) بـهێنن و تەنـها پشـت بـە قورئـان و فـەرموودە ببەسـتن و ( فقـه ) لـەوان دەربـهێنن . چونکـە زانسـتی ( کـلام ) پڕیەتیلە هەوا و ئارەزوو . لەبەر ئەوە پێی خۆش نەبوو لە کۆڕی ئەودا موسڵمانان خـەریکی

ببن و ، ریوایەتیش کراوە کە فەرمووویە : « ئەگەر خەڵکیی بزان عیلمی کەلام چ ( اهواء )ێکی تێدایە ، ئەوا وەکێ لە دەستی شێر هەڵ دێن لە دەستی ئەویش هەڵ دێن » .[207]

هەروەها ئەیفەرموو : « حوکمی من بۆ ئەهلی کەلام ئەوەیە بە لقی دارخورما لێیان بدرێت و ، بە ناو عەشیرەت و هۆزەکان دا بگێڕرێن و ، جاڕ بدرێت : ئەمە سزای ئەو کەسەیە کە وازی لە سوننەت هێناوە و ، خەریکی زانستی ( کەلام )ە » .[208]

هەروەها ئیمامەکانی تریش ، بە تایبەتیی مالیکێ و ئەحمەد ، هەمان رایان بووە .. چونکە لە سەردەمی ئەواندا وایان پێ باش لە ظاهیری قورئان و حەدیث عەقیدە وەربگرن، بەبێ درێژە پێدان ، هەتا عەقیدەی موسڵمانان پارێزراو بێت .

بەڵام لە سەرەتای صەدەی چوارەمەوە هەندێ لە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە بە پێویستیان زانیی ، وەڵامی بیدعەچییان هەر بەو چەکە بدەنەوە کە وا بە دەستیانەوە .. جا پێشەنگی ئەم کارە بە دەستی دوو ئیمامی بەرێز بوو ، کە ئیمام ئەبولحەسەنی ئەشعەریی شافیعیی و ئەبومەنصووری ماتریدیی حەنەفیی بوون . ئەوەبوو لەسەر رێبازی قورئان و سوننەت زانستی ( کلام ) یان دارشت . دوای ئەوانیش زانایانی تر هاتن و ئەم زانستەیان فراوان کرد هەتا بووە زانستێکی ئیسلامیی بڕوا پێکراو و ، وای لێ هات فەقیهەکانی شافیعیی فێربوونی بە فەرزی عەین و فەقیهەکانی حەنەفییش بە فەرزی کیفایەی دابنێن .

جا ئەو زانستی ( کلام )ەی کە ئیمامەکان رەخنەیان لێی هەبوو ئەم زانستە ئیسلامییە نەبوو ، بەڵکو زانستێ بوو کە لە قسەی هیچ و پووچی موعتەزیلە و مورجیئە و رافزییەکان پێکێ هاتبوو ..

کاتێکێ کە موعتەزیلە ئەو را هەڵەیەی خۆیان دەربارەی خەلقی قورئان خستە روو ، زانایانی سەلەف وتیان : « القرآن کلام الله ، لا نقول مخلوق ، ولا غیر مخلوق » . بەڵام ئیمامی شافیعیی رای خۆی دەربڕیی و وەکێ سەلەف فەرمووی : « القرآن کــــلام الله » . پاشان فەرمووی : « غیر مخلوق » بگرە کەسێکێ بیوتایە قورئان مەخلووقە بە کافری لە قەڵەم دەدا .. رەبیعی کوڕی سولەیمان ئەڵێت : کەسێکێ کە متمانەم پێی هەبوو بۆمی باس

---

[207] مفتاح السعادة ( ٢ : ٢٦ ) .

[208] مفتاح السعادة ( ٢ : ٢٦ ) .

کرد و وتی : لە مەجلیسی شافیعییدا ئامادەبووم ، ( حفص الفــرد ) وتـی : « القــرآن مخلوق » شافیعیی فەرمووی : « کفرتَ بالله العظیم » .[٢٠٩]

هەروەها لەو سەردەمەدا ئەوە بلاوبوویەوە کە ئیمان بریتی‌یە لە بڕوای دڵ و دەربڕینی زمان . جا هەرکەی مرۆڤ چاکیی دین لە دڵیا سەلما و بە زمانیش دەری‌بڕیی ، ئەوا ئەو کەسە موسڵمانێکی تەواوە و ئیمان و ئیسلامی بێ‌لەکەیە . هەندێکی تریش رایان وەها بووە کە ئیمان دوای بڕوای دڵ و دەربڕینی زمان بریتی‌یە لە کار و هەڵس و کەوتی ئەندامەکان .. کەواتە هەتا موسڵمان کردەوەی چاك زۆرتر ئەنجام بدات ئیمانی بەهێزتر دەبێت . ئیمامی شافیعییش ئەمە رای بوو و ، بە پێی ئەم ئایەتانەش بڕوای وەها بوو کە ئیمان زیاد دەکات تا خاوەنەکەی بخاتە بەهەشتەوە و ، کەمیش دەکات تا بە دۆزەخی بگەیەنێ :

﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ ( الأنفال : ٢ ) .

﴿ وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَانًا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ ( التوبة : ١٢٤ ) .

﴿ هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ ﴾( الفتح : ٤ ).

رەبیع ئەڵێت : گوێم لە شافیعیی بوو دەی‌فەرموو : « الإيمان : قول وعمــل ، يزيد وينقص » .

هەروەها لە بارەی بینینی خوای گەورەوە لە لایەن ئیمانداارنەوە جمهووری زانایانی سەلەف لەسەر ئەو رایەن کە بەهەشتی‌یان لە قیامەتدا پەروەردگاریان دەبینن . ئەمەش بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ ۞ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴾( القيامة : ٢٢ ـ ٢٣ ) .

هەروەها به پێی ئەم فەرموودانەش :

لە صوهەیب ەوە ـ خوا لێی رازیی بێ ـ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : « إذا دخل أهل الجنة الجنة ، قال الله تبارك وتعالى : تريدون شيئاً أزيدكم ؟ فيقولون : الم تبيض وجوهنا ؟ ألم تدخلنا الجنة وتنجنا من النار ؟ قال : فيكشف الحجاب ، فما أعطوا شيئاً أحب إليهم من النظر إلى ربهم عزوجل . وفي رواية ، ثم تلا : ﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ ﴾ » ( يونس : ٢٦ ) . رواه مسلم .

---

[٢٠٩] آداب الشافعي ( ١٩٤ ) .

دەفەرموێ : کاتێک کە بەهەشتییان چوونە بەهەشتەوە ، خوای گەورە پێیان دەفەرموێ : دەتانەوێ شتێکی تریشتان بۆ زیاد بکەم ؟ ئەوانیش ئەڵێن : ئەی تۆ دەم و چاوی ئێمەت سپیی نەکردووە ؟ ئەی تۆ ئێمەت نەخستۆتە بەهەشتەوە و لە ئاگری دۆزەخ دەربازت نەکردووین ؟ ئەفەرموێ : خوای پەروەردگار پەردەکان لا دەدات ، ئیتر بەهەشتیان هەرچیی ناز و نیعمەتێکیان پێدراوە هیچی ئەوەندەی سەیرکردنی پەروەردگاری مەزنیان بەلاوە خۆش نیە . لە ریوایەتێکیشدا هاتووە : پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێند : ﴿ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ ﴾ .

جەریری کوڕی عەبدوڵلاش ـ خوا لێی رازیی بێ ـ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووین و ، لە شەوی چواردەدا سەیرێکی مانگی کرد و ، فەرمووی : « إنكم سترون ربكم عياناً كما ترون هذا القمر ، لا تضامون في رؤيته فإن استطعتم ألا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس وقبل غروبها فافعلوا » .

فەرمووی : هەروەک ئەم مانگە دەبینن ، وەهاش بە ئاشکرا پەروەردگارتان دەبینن و ، لە بینینیشی تێر ناخۆن . جا ئەگەر توانیتان با نوێژی پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوابوونتان لە کیس نەچێت ، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێند : ﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴾ ( ق : ٣٩ ) متفق عليه .

جا بڕوابوون بە بینینی خوا رای ئەبوبەکری صددیق و ، ئیمام عەلییە و ، لە ریوایەتێکیشدا رای حوذەیفەی کوڕی یەمان و ،[٢١٠] و عوبادەی کوڕی صامیت و ،[٢١١] کەعبی کوڕی عوجرە و ،[٢١٢] ئەبوموسا و ،[٢١٣] صوهەیب و ،[٢١٤] ئیبن عەبباسە و ، رای کۆمەڵێک لە تابیعینیشە .[٢١٥]

---

[٢١٠] حوذەیفەی کوڕی حسل ی کوڕی جابری عەبسیی ، ئەو هاوەڵەیە کە خاوەنی نهێنیی پێغەمبەر بوو ﷺ لە بارەی مونافیقەکانەوە . ساڵی (٣٦) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[٢١١] عوبادەی کوڕی صامیت ی کوڕی قەیسی خەزرەجیی ئەنصارییە ، هاوەڵێکە کە ئامادەی هەردوو پەیمانی عەقەبە و جەنگی بەدر بووە . لە ساڵی ( ٣٤ ) ی کۆچییدا لە رەملە کۆچی دوایی کردووە . .

[٢١٢] کەعبی کوڕی عوجرەی کوڕی ئومەییە ، هاوەڵێکە و ئامادەی هەموو رووداوەکان بووە و ، ئەم ئایەتە پیرۆزەش دەربارەی ئەو هاتۆتە خوارەوە : ﴿ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴾ . لە مەدینەدا و لە ساڵی ( ٥١ ) ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە .

[٢١٣] ئەبوموسای ئەشعەریی ، عەبدوڵلای کوڕی قەیسی کوڕی سەلیمە ، هاوەڵێکی مەزن و والییەکی ئازا و بەجەرگ بووە . یەکێکە لە حەکەمەکانی نێوان ئیمام عەلیی و موعاویە ـ خوا لە هەموویان رازیی بێ ـ دوای جەنگی صیففین . ساڵی ( ٤٤ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

جا بەڵگەی شافیعیی لەسـەر ئـەوەی کـە دۆسـتانی خـوا لـە قیامـەتدا خـوای گـەورە دەبینن لەم ریوایەتەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

موزەنیی لە ئیبن هەرەم ەوە دەگێڕێتەوە و ئەڵێت : گوێـم لـە شـافیعیی بـوو دەربـارەی فەرمایشتی خوای گەورەوە : ﴿ كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُـونَ ﴾ ( المطففـين : ١٥ ). دەفەرموێ : ئەمە بەڵگەیە کە دۆستانی خوا لە ئاخیرەتدا خوای گەورە دەبینن .[٢١٦]

رەبیعیش ئەڵێت : رۆژێکیان لە خزمەتی شافیعییدا بووم و لە صەعیدەوە نامەیەکی بۆ هاتبوو کە دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورەوە : ﴿ كَـلا إِنَّـهُمْ عَـنْ رَبِّـهِمْ يَوْمَئِـذٍ لَمَحْجُوبُونَ ﴾ پرسیاریان لێ کردبوو .. ئەویش نووسیبەوە : « کە بە هۆی رەنجانی خواوە کۆمـەڵێک لـە بینینـی خـوا بێبـەش بـوون ، ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە بـە هـۆی رەزامەندیی خواوە کۆمەڵێکی تر دەیبینن » . منیش لێم پرسیی : گەورەم ! ئایا تۆ خۆت بروات بەوە هەیـە ؟ فـەرمووی : « بـەخوا ئەگـەر بـەلای موحەممـەدی کـوڕی ئیدریسـەوە یـەقین نەبووایـە کــە : لـە قیامـەتدا پـەروەردگاری دەبینــێ ، ئــەوا لــە دنیــادا نەیدەپەرست ».[٢١٧]

هەروەها لە بارەی پلەبەرزی هاوەڵانەوە شافیعیی رای جوانی هەیە . چونکە هـاوەڵان خوا لێیان رازی بێ . هەر هەموویان عەدڵن .. هەر هەموو ماڵگی بەردەم خۆری پێغەمبەرایەتیین و ، دەروونی هەر هەموویشیان بە نووری پێغەمبەرایەتیی تەزکیە کرابوو و ، هەردەم چاویان لـە هـەڵس و کەوتی پێغەمبەری ئازیزیان دەبوو و ، خۆیان لەسەری پەروەردە دەکرد ، بە رادەیەک کە قورئانی پیرۆز دەهاتە خوارەوە و ستایشی دەکردن :

﴿ كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾ ( آل عمران : ١١٠ ) .

---

[٢١٤] صوهەیبی کوڕی سینانی کوڕی مالیکە کە بەصوهەیبی رۆمیی ناسراوە . یـەکێ لـە تـیران دازتریـن پیـاوی عـەرەب زۆر . لە ناو ئێرم و کەش و کارەکەیدا ، کە لەسەر فورات دەژیان . لە دایک بووە و ، کاتێ کە رۆمەکان هێرش دەکەنە سەر ناوچەکەیان ئەوسیش بە کۆیلەیی دەکەوێتە دەستیان و ، یەکێ لە نەوەی ( کەلب ) یش لە رۆمەکانی دەکڕێت و دەیهێنێ بۆ مەککە و ، لەوێ عەبدوڵلای کوڕی جەدعان ئەی کڕێ و پاشان ئازادی دەکات . کاتێک کە ئیسلام هات ئەویش موسڵمان بوو و ، کاتێ ئە ویستی وەک موسڵمانەکان کۆچ بۆ مەدینە بکات . بت پەرستەکانی مەککە رێیان پـێ گرت و نەیانهێشت سامانەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێت ، ئەویش لەبەر خاتری هیجرەت دەستی لە سامانە فراوانەکەی هەڵ گرت بۆ کافرەکان ، بەو مەرجەی رێی بدەن و کۆچ بکات . ئامادەی بەدر و ئوحود و رووداوەکانی تریش هەر هەموو بوو . ساڵی ( ٣٨ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

[٢١٥] تەفسیری ( قرطبي ) ( ٨ : ١١٠ ) .

[٢١٦] الإنتقاء ( ٨١ ـ ٨٢ ) .

[٢١٧] طبقات الشافعية ( ٢ : ٨١ ) .

﴿ وكذلك جعلناكم أمّة وسطا ﴾ ( البقرة : ١٤٣ ) .
﴿ والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار والذين اتبعوهم بإحسان رضي الله عنهم ورضوا عنه ﴾ ( التوبة : ١٠٠ ) .

پێغەمبەری ئازیزیش ﷺ لە چەندین فەرمووده‌دا ستایشیان دەکات . ئەوەتا ـ بۆ نموونە ـ عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە : « الله الله في أصحابي لا تتخذوهم غرضاً ، فمن أحبهم فبحبي أحبهم ، ومن ابغضهم فبغضي أبغضهم ، ومن آذاهم فقد آذاني ، ومن آذاني فقد آذى الله ، فيوشك أن يأخذه » رواه الترمذي وابن حبان في صحيحه .

لەم فەرموودەدا دەری دەبڕێ کە خۆشویستنی هاوەڵان خۆشویستنی خۆیەتی و ، رق لێبوونەوەیان رق لێبوونەوە لە خۆیەتی و ، هەرکەس ئازاریان بدات ئەوا ئازاری ئەوی داوە و ، هەرکەسیش ئازاری ئەو بدات ئازاری خوای داوە و ، لەوانەیە خوای گەورە لەناوی بەرێت ..

ئەبوزەرعەی رازییش دەیوت : « هەرکەستان دیی یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە سووکی باس دەکات چاک بزانن ئەوە زیندیقە . چونکە پێغەمبەر حەقە و ، قورئان حەقە و ، ئەو ئیسلامەش هێناویەتی حەقە . جا ئەمە هەر هەمووی هاوەڵان بە ئێمەیان گەیاندووە . جا ئەو زیندیقانە دەیانەوێ متمانە لە شاهێدەکانمان بسێننەوە تا قورئان و سوننەت بەتاڵ ببنەوە . دەی کەواتە وا چاکە متمانە لەوانە بسەنرێتەوە و ، ئەوانە زیندیقن »[٢١٨].

بۆ جیاوازیی پایە و پلەی هاوەڵان لەنێوان خۆیاندا چەندین ئایەتی قورئان ئاماژەیان بۆ کردووە وەک : ﴿ لا يستوي منكم من أنفق من قبل الفتح وقاتل أولئك أعظم درجة من الذين أنفقوا من بعد وقاتلوا وكلا وعد الله الحسنى ﴾ ( الحديد : ١٠ ) .

ئەم ئایەتە پلەی هاوەڵانی پێش فەتحی مەککە لە پلەی هاوەڵانی دوای فەتح جیا دەکاتەوە .

ئەم ئایەتەشیان پلەی موهاجیر و ئەنصارە پێشینەکان بە بەرز لە قەڵەم دەدات : ﴿ والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار ﴾ ( التوبة : ١٠٠ ) .

هەروەها زوو ئیمان هێنان و سەر و ماڵ بەخشین و کۆمەکیی و پشتیوانییکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێتە مایەی بەرزیی پایە و پلەی هاوەڵان و سەرکەوتنیان :

---
[٢١٨] عن كتاب الكفاية .

﴿ فَـالَّذِينَ آمَنُوا بِـهِ وعَزَّروه ونَصَرُوه واتَّبَعُوا النُّور الذِي أُنـزِل مَـعَهُ أُولَئِكَ هُـمْ الْمُفْلِحُونَ ﴾ ( الأعراف : ١٥٧ ) .

دیسـان هاوەڵـە پایـەدارەكانیش هـەندێكیان لـە هـەندێكی تریـان لـە پێش‌تـرن . جـا پێشەوایانی ئیسلام هاتوونەتە سەر ئەو رایە كە چاكترین كەسی ئوممەتی پێغەمبـەر دوای خۆی: ئەبوبەكر، پاشان عومەر، پاشان عوثمان ، پاشان عەلی‌یە ـ خوا لێیان رازیی بێ ـ .

ئەمـە رای ئیمـامی شـافیعییە و بەوپـەڕی راستیی‌ویسـتی‌یەوە فـەزڵی ئەبوبـەكر و عومەری بەسەر ئیمامی عەلیی‌دا دەدا ، هەرچەندە ئیمام ئامۆزای بوو ![219]

جا ئیمام شافیعیی بەرگرییەكی چاكی لە ئال و بەیت دەكـرد ، هەرچـەندە لـەو كاتـەدا هەركەسێ دۆستایەتیی بۆ ئال و بەیت دەربڕیایە بە رافضـي تـاوان بـار دەكـرا ، تـا ئـەو رادەیە كە ئەم دێڕە شیعرەی لەو بارەوە فەرمووە :

إن كان رفضاً حب آل محمدٍ

فليشهد الثقلان أني رافضي

لە هەمان كات‌دا ئیمام شافیعیی رافضەی زۆر بە خراپ زانیون . هـەتا فەرموویـە : ( لم أر أحداً ـ من أصحاب الأهواء ـ أشهد بالزور من الرافضة ) .[220]

یوونسی كوڕی عەبدولئەعلا وتوویە : گوێم لە شافیعیی بووە كاتێ كە باسی رافضـە بكرایە زۆر بە عەیبداری لە قەڵەم دەدان و دەی فەرموو : ( شرُّ عِصابةٍ ) .[221]

هەروەها لەبارەی خەلافەتیشەوە دەی‌فەرموو : خەلیفەكان پێنجن : ئەبوبەكر و ، عومەر و ، عوثمان و ، عەلیی و ، عومەری كوڕی عەبدولعەزیز » .[222]

هەروەها ئیمام شافیعیی بە سەرنج‌دانی قورئـانی پـیرۆز رایـەكی جوانـی هەیـە لـەبارەی بینینی جیننی‌یەوە .. دەربارەی رەسەنی جینـن ەوە ئیسـماعیل لـە حەسـەنی بەصریی‌یـەوە ریوایەتی كردووە كە وتوویە : جینن لە ئیبلیس بوون و ئینسیش لە ئادەم . جا ئەمانەیش و ئەوانـەیش ئیمـانداریـش و كافریشـیان تێدایـە و ، لـە پاداشـت و سزاش‌دا هاوبەشـن . جـا

[219] طبقات السبكي ( ١ : ١٩٤ ) .
[220] آداب الشافعي ( ١٨٧ ) .
[221] توالي التأسيس ( ٦٤ ) .
[222] آداب الشافعي ( ١٨٩ ) .

لەمانیش و لەوانیش هـەرکامیان ئیمـاندار بێت ئـەوە ( وەلیـی ) خوایـە و ، لـەمانیش و لەوانیش هەرکامیان کافر بوو ئەوە شەیتانە .. [٢٢٣]

جا ئیمام شافیعیی بە بۆنەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە : ﴿ إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ﴾ ( الأعراف : ٢٧ ) ، دەری بڕیوە کە هەرکەسێکی عادیل بڵێ جیننییم دیـوە ئـەوا لە شاهێدیی دەخات ، مەگەر ئەو کەسە پێغەمبەر بێت .

## ( ٦ ) شارەزایی زمان و شیعر :

خوای گەورە وەهای بۆ شافیعیی هێنایە پێش کە ببێتە یەکێک لە چوار ئیمامە بـەناو بانگەکەی ئیسلام کە دوای هاوەڵان و حەزرەتی مەهدیی - خـوا لێـیان رازیـی بـێ - هیـچ کەس شان لە شانیان نادات [٢٢٤] ، بگرە بووە یەکەمی هەر چوارەکەیش و ، دەستێکی باڵای هەبوو لە ئیجتیهاددا و نازناوی ( ناصر الســـنة ) شـی وەرگـرت . ئەگـەر وا نەبوایـە ئـەوا دەبـووە مـەزن‌تریـن ئەدیـب و نووسـەر و شـاعیری عـەرەب . چونکـە وەک لـە بنـەڕەتدا عەرەبێکی قورەیشیی بوو ، لە هەموو کەس زیاتر هەوڵی دەدا زمانی بە پاکیی بهێڵێتەوە ، چونکە ئەوە بوو کە لە حەوتساڵیی‌دا قورئانی خەتم کرد مەککەی بەجێ هێشت و چوو بۆ بادیە بۆ ناو هۆزی هوذەیل - کە لەناو عەرەبدا لە هەموو هۆزێک زمـانپاراو تربـوون - و زۆر بـە چـاکیی زمـانی رەوان کـردن و مـاوەی حـەڤدە سـاڵ لـە ناویـاندا مایـەوە . تـا کـە گەڕایەوە مەککە وەک قوتابیانی شـەریعەت ئامـادەی کـۆڕی دەبـوون ، قوتابیـانی زمـانی عـەرەبییش ئامادەی دەبوون .

حەسەنی کوڕی موحەممەدی زەعفەرانیی ئەڵێت : « کۆمـەڵێک لەوانەی کە حەزیان لـە زمانی عـەرەبیی بوو لەگەڵمانا دەهاتنە کۆڕی شـافیعی‌یەوە و ، لـە لایەکـەوە دادەنیشـتن . ئەڵێت : بە یەکێک لە سەردارانیانم وت : ئێوە زانست وەرناگرن ، ئەی بـۆچ دێنـە لامـان ؟ وتیان : گوێ لە زمانی عەرەبیی شافیعیی دەگرین » . [٢٢٥]

---

[٢٢٣] الجامع الأحكام القرآن : ( ١٩ : ٥ ) .

[٢٢٤] كليات رسائل النور لبديع الزمان سعيد النورسي ، ج٢ المكتوبات ص ٣٦٢ .

[٢٢٥] معجم الأدباء ( ١٧ : ٢٩٩ ) .

بەڵێ ، ئەگەر شافیعیی خەریکی عەرەبیی بوایە دەتوت : لەمەدا پسپۆڕە و ، گەر لە بارەی شیعرەوە باسی بکردایە دەتوت : لەمەدا پسپۆڕە و ، گەر لە بارەی فیقهیشەوە باسی بکردایە دەتوت : لەمەدا پسپۆڕە ، وەک یوونسی کوڕی عەبدولئەعلا وتوویە .[٢٢٦]

ئیمام شافیعیی ئەوەندە شارەزای عەرەبیی بوو و جێی متمانەی زمان زانان بوو ، وەک وتەی هۆزێک بە بەڵگە دەهێنرایەوە ، فەرمایشتی ئەویش بە بەڵگە دەهێنرایەوە .

مووسای کوڕی ئەبوجاروود وتوویە : « كان يقال : إن محمد بن إدريس وحده يحتج به كما يحتج بالبطن من العرب » .[٢٢٧]

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش فەرموویە : « كلام الشافعي في اللغة حجة » .[٢٢٨]

ئەییووبی کوڕی سوەیدیش وتوویە : « خذوا عن الشافعي اللغة » .[٢٢٩]

ئەبوعوبەیدیش ئەیوت : « كان الشافعي ممن تؤخذ عنه اللغة » .[٢٣٠]

ثەعلەبیش دەربارەی ئەوەی کە هەندێک رەخنەیان لە زمانی شافیعیی دەگرت دەریدەبڕێ کە شافیعیی ئەو پیاوە نیە رەخنەی لێ بگیرێ ، چونکە ئەو رۆڵەی زمانی عەرەبی‌یە و پێویستە عەرەبیی لەو وەربگرێ کە ئەڵێ : « يأخذون على الشافعي وهو من بيت اللغة ، يجب أن يؤخذ عنه اللغة » .[٢٣١]

موزەنیی ئەڵێت : « کە شافیعیی هاتە میصر ، لەو کاتەدا عەبدولمەلیکی کوڕی هیشامی نەحویی ، خاوەنی مێژووی غەزەواتی لێبوو ، کە لە زمانی عەرەبیی و شیعردا کەڵەزانای سەردەمی خۆی بوو .. هەستا چوو بۆ لای شافیعیی و پاشان دەیوت : پێنازانم خوای گەورە کەسێکی تری وەک شافیعیی بەدیی هێنابێ . پاشان فەرمایشتی شافیعیی دەکردە بەڵگە بۆ زمانی عەرەبیی .[٢٣٢]

هەروەها شافیعیی لە شیعری عەرەبیی کۆندا شارەزایی‌یەکی چاکی پەیدا کردبوو ، چونکە ئەو ماوە زۆرەی کە لەناو هوذەیلدا مایەوە هەلێکی باشی بۆ رەخساند تا شیعری

---

[٢٢٦] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣٠٠ ) .
[٢٢٧] الطبقات الكبرى ( ٢ : ١٦١ ) .
[٢٢٨] توالي التأسيس ( ٥٧ ) .
[٢٢٩] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٠ ) .
[٢٣٠] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٠ ) .
[٢٣١] توالي التأسيس ( ٦٢ ) .
[٢٣٢] تهذيب الإسماء والغزوات ( ١ : ٦٢ ) .

شاعیره هوذەیلیەکان بە جوانیی و بەتێگەیشتنەوە لەبەر بکات و بە وردیی لێیان تێ بگات ، کە حەفتا و ئەوەندە شاعیری ناودار و لێهاتوویان بووە .. دیارە ئەمەش زانستێکی زۆرە کە رۆڵەکانی ئەو هۆزە لە مێشکیاندا پارێزگارییان لێدەکرد و شافیعییش بە تەنیا هەر هەمووی لەبەر کرد . بە رادەیەک کە کەڵەزانای ئەو بوارە ـ وەک ئەصمەعیی ـ سەریان لە شافیعیی دەدا تا شیعری هوذەیلی لێوەربگرن ، یاخود ئەوەی کە لایانە راستی بکەنەوە .[٢٣٣]

نەک تەنها شیعری هوذەیل ، بەڵکو شیعری زۆرێک لە شاعیرانی هۆزەکانی تریشی لەبەر دەکرد .

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولحەکەم ئەڵێت :

گوێم لە شافیعیی بووە کە فەرموویە : « شیعرم لە سێصەد شاعیری دێوانەوە ریوایەت کردووە » .[٢٣٤]

ئەمە هەمووی بووە مایەی ئەوەی کە شافیعیی ببێتە شارەزایەکی وەها کە لە کاتی قسەکردندا بە عەرەبیی یەکجار فەصیح قسە بکات .

خۆ ئەگەر بەو زمانە کتێبی بنووسیایە بە ئاسانیی هەموو کەسێک لێی تێنەدەگەیشت ، بەڵکو هەوڵی ئەدا بە ئاسانترین شێواز بۆ عەوام بنووسێت، وەک رەبیع بۆمانی باس دەکات .[٢٣٥]

هەروەها جاحیظ شاهێدیی لەسەر ئەوە دەدات کە نووسینی شافیعیی لە هەموو نووسینێک جوانترە و کەسی وەک ئەویشی نەدیوە کە ئەڵێت : « نظرت في كتب هؤلاء النبغة، الذين نبغوا في العلم، فلم أر أحسن تأليف من المطلبي، كأن فاه ينظم دراً إلى در ».[٢٣٦]

هەروەها ئەبو ثەور ئەڵێت :

« هەرکەسێ بڵێ: لە بارەی زانست و، زمان پاراویی و، شارەزایی و، بەیان و، لێ هاتنەوە پیاوێکی تری وەک شافیعیی دیوە ئەوا درۆ ئەکات ».[٢٣٧]

---

[٢٣٣] تهذيب الأسماء واللغات ( ٥٠ ) . وفيات الأعيان ( ١ : ٥٦٥ ) .

[٢٣٤] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٠ ) .

[٢٣٥] توالي التاسيس (٧٧).

[٢٣٦] توالي التأسيس (٥٩).

[٢٣٧] الوافي بالوفيات (١: ١٧٧).

لە بارەی خوێندنی (نەحو)ەوە لە هیچ سەرچاوەیەکدا ئاماژە بۆ ئەوە نەکراوە کـە شافیعیی لەلای هیچ کەس ( نحو ) ی خوێندبێ ، لەبەر ئەوەی کە پێویستی بـە خوێندنـی نەبووە . چونکە ماوەیەکی زۆر لەناو هۆزی هوذەیلدا ژیابوو و خۆی لە هەموو کـەس زیـاتر شارەزای یاسـاکانی زمـانی عـەرەبیی بـوو . بـەڵام پێـی خۆش بـووە چـاوی بـە ( خلیـل ) بکەوتایە کە شارەزایی‌یەکی چاکی لە عـەرەبیی‌دا هـەبووە ، بـەڵام بـە فـەرمانی خـوا بـۆی ڕێک نەکەوت چونکە خەلیل لـە بـەصرە و لـە ساڵی ( ١٧٠ ) دا کۆچی دوایـی کـرد و ، ئەمیش هێشتا لە مەدینەدا لە خزمەتی ئیمام مالیکدا بوو .

جا ئیمـام شـافیعیی هـۆی زمـانپـاراویی و زمـان هـەڵنەکـەوتنی ، ئەگـەرچیی تاقـە جارێکیش بێت ، ئەگێڕێتەوە بۆ ئەو خەوەی کە بە منداڵیـی بـە پێغەمبـەری خوایـەوە ﷺ دیی بوو .

ڕەبیع ئەڵێت : لە شافیعییم بیستووە کـە دەیفـەرموو : پێش بـاڵغ بـوونم لـە خـەودا پێغەمبـەرم ﷺ بینیی و پێمـی فـەرموو : « یـا غـلام ! » وتم : لبیـك یارسـول الله ! فەرمووی : « ممن أنـت ؟ » . وتم : لـە دەسـتە وکەسـی خـۆتم . فـەرمووی : لێـم نزیـک بەرەوە .. منیش لێی نزیک کەوتمەوە ، ئەوە بوو دەممی کردەوە و تفی دەمی خـۆی هێنـا بەسەر زمان و دەم و هەردوو لێومدا و فەرمووی : « امض بارك الله فيك » . ئیتر بە بیرمدا نایەت نە لە گێڕانەوەی فەرمووده و نە لە خوێندنەوەی شیعردا زمانم هەڵ کەوتبێ .[٢٣٨]

عەبدولمەلیکی کوڕی هیشامی نەحوییش وتوویە :

« لە خزمەتی شافیعیی‌دا یەکجار زۆر دانیشتووین ، هەرگیز لەنگەیـەکم لێ نەبیسـتووە و وشەیەکیشم لێ‌نەبیستووە کە لەوە جوانتر هەبێت » .[٢٣٩]

ئیمام شافیعیی تواناییەکی چاکی هەبووە بۆ وتنی شیعر بە بۆنەی زیرەکیی و لێ‌هاتنـەوە و ، بە بۆنەی ئەو هەمووە شیعرەوە کە لەبەری کردبوو، بەڵام وازی لە نووسینی شیعر هێنـا و رووی لە فیقهـ و ئیجتیهاد کرد ، تا بووە کەڵـەزانای فیقـهی ئیسـلامیی ، هەرچـەندە بـۆ هـەندێ هەڵوێسـت کەمـە کەمـە شـیعری وتـووە . بـەڵام کۆمەڵـە شـیعرێکی زۆر بـە نـاوی شافیعی‌یەوە تۆمار کراون کە هەندێکی لە هی ئەو دەچن . هەتا ئەو دیوانەش کە بـە نـاوی

---

[٢٣٨] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٥ ) .

[٢٣٩] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١٢ ) .

ئەوەوە بلاوکراوەتەوە ، هەر هەمووی هی ئەو نیە . چونکە ئەگەر شافیعیی دیوانی شیعری بنووسیایە لە ئاستێکی لەوە بەرزتردا دەینووسیی .[240]

بۆ نموونە ئەوەتا بەرگریی لەوە دەکات کە ئامادەیە لە پێناوی خۆشویستنی ئال و بەیتدا خەڵکیی بە رافیزییشی لە قەڵەم بدەن کە ئەفەرموێ :

إن كان رفضاً حب آل محمد    فليشهد الثقلان أني رافضي [241]

هەروەها سۆز بۆ شاری غەززەی خۆشەویستی لە فەلەستین ، کە لەوێ لە دایک بووە و لە تەمەنی دوو ساڵییدا بەجێی هێشتووە ، دەردەبڕێ و ئەفەرموێ :

( وإني لمشتاق إلى ارض غزة    وإن خانني بعد التفرق كتماني
سقى الله ارضاً لو ظفرت بتربها    كحلت به من شدة الشوق أجفاني [242]

هەروەها لە بارەی رەوشتی جوانەوە وەک بێدەنگیی یان کەم قسە کردنەوە بە شیعر فەرموویە :

لاخير في حشو الكلا    م إذا اهتديت إلى عيونه
والصمت أجمل بالفتى    من منطق في غير حينه
وعلى الفتى لطباعه    سمة تلوح على جبينه [243]

ئیمام شافیعیی وەک مرۆڤێکی زۆر زیرەک و زۆر لێهاتوو ، بە وردیی سەرنجی ژیان و دنیای دەگرت .. خەڵکی چاک دەناسی .. زۆر هەوڵی دەدا تا دۆستی راستەقینەی دەست بکەوێ ، کەچیی بێهوودە بوو . هەتا ئەوە بوو ئەم دێڕە شیعرانەی فەرموون :

عمرتُ الدهر ملتمساً بجهدي    أخا ثقة فأكداه التماسي
تنكرتِ البلادُ عليَّ حتى    كأن أناسها ليسوا بناسِ [244]

هەتا ئەوەندە بە راستیی بۆ دۆست دەگەڕێ ، ئامادەیە ئەگەر دەستی بکەوێ سامانی دنیا و چاکەی قیامەتی لەگەڵدا بەش بکات .. موزەنیی دەگێڕێتەوە کە شافیعیی دەستی گرتووە و ، فەرموویە :

أحبُّ منَ الإخوان كل مواتِ    وكل غضيض الطرف عَن عثراتِ

---

[240] الإمام الشافعي ، فقيه السنة الأكبر ( ٢٨٤ ) .
[241] الإنتفاء ( ٩١ ) .
[242] معجم البلدان ( ٦ : ٢٩٠ ) .
[243] توالي التأسيس ( ٧٣ ) .
[244] طبقات الشافعية ( ١ : ٣٠١ ) .

يصـاحـبني في كل أمرٍ أحـبه ويحفظني حيـا وبعد مـمـاتـي
فمن لي بهذا ليـت أني أصبته فقاسـمته مالي مع الحسنـات [٢٤٥]

لەو بارەشەوە کە دنیا ، وەک باوەژنێکی بێسۆز و بەزەیی ، بەرامبەر بە مرۆڤـە ژیـر و بلیمەتەکان ، دژایەتیی دەکات فەرموویە :

ومن الدليل على القضاء وكونه بؤس اللبيب وطيب عيش الأحمق
وأحق خلق الله بـالهَـم امرؤٌ ذو همةٍ يبلى بعيـش ضيـق [٢٤٦]

لە هەمان کاتدا ئیمام شافیعیی شارەزاییەکی چاکی لە مێژووی نەفامیی و مێژووی ئیسلامیی هەبوو و ، لە رووداوەکانی هۆزە عەرەبەکان لە نێوان خۆیاندا و لەگەڵ رۆم و فارسدا ئاگادار بوو .

هەروەها لە پشت و رەچەڵەکی هۆزەکان چاک شارەزا بوو ، هەتا ئیبن هیشامی خاوەنی سیرەت و غەزەوات لە چاو شافیعییدا هیچی نەدەزانی . [٢٤٧]

## ( ٧ ) فیراسەتی شافیعیی :

شافیعیی بۆ کۆکردنەوەی کتێبی فیراسەت و ئەستێرەناسیی بەرەو یەمەن دەکەوێتە رێ و ، لەوێ هەموویان کۆدەکاتەوە و دەیاننووسێتەوە . پاشان کە دەیەوێ بگەرێتەوە ، لە رێگایدا بە لای پیاوێکدا تێپەڕ دەکات کە لە پەنای خانووەکەیدا دەستەئەژنۆ دانیشتبوو ، کە کۆسەیەک بوو هەردوو چاوی شین و ناوچاوی دەرپەڕیی بوو . ئەفەرموێ : میوان رائەگرن ؟ ئەڵێ : بەڵێ . هەرچیی لە ئیمام شافیعییە سیفەتی ئەم پیاوە هیچیان چاک نین . کەچیی کە لا دەدات دەبینێ پیاوێکی زۆر سەخییە ، نانی ئێوارە و بۆن خۆشیی و ئالیکی ولاغەکەی و ، نوێن و پێخەفی بۆ دەنێرێ .. بە درێژایی شەو ئەم دیو و ئەودیو دەکات و بیر لەوە دەکاتەوە چیی لەو کتێبانە بکات .. چونکە خاوەن ماڵ بە پێچەوانەی فیراسەتەوە دەرچوو . سیفەتەکانی خراپ ، کەچیی خۆی سەخیی و بەرێز دەرچوو . ئیتر بریاری دا کتێبەکان فرێ بدات . کە رۆژی لێ دەبێتەوە بە خزمەتگوزارەکەی ئەفەرموێ : ولاغەکە زین بکە . کە سوار دەبێ و دەیەوێ خواحافیزیی

---

[٢٤٥] توالي التأسيس ( ٧٤ ) .
[٢٤٦] توالي التأسيس ( ٧٥ ) .
[٢٤٧] الوافي بالوفيات ( ٢ : ١٧٥ ) و توالي التأسيس ( ٦٠ ) .

بکات بە کابرا ئەفەرموێ : ئەگەر هاتیتە مەککە و ، بە لای ( ذوطــــوی ) دا تێپـەڕت کرد پرسیاری ماڵی موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعیی بکە . بەمە دەیـەوێ خزمـەتی بکات و پاداشتی ئەم میوانداریـیەی بداتەوە .

کابرا پێی ئەڵێ : بۆچ من خزمەتکاری باوکتم ؟

ئەفەرموێ : نەخێر .

ئەڵێ : ئەی هیچ خزمەتێکت قەرزارم ؟

ئەفەرموێ : نەخێر .

ئەڵێ : ئەی من لە دوێنێوە مەسرەفت بۆ ئەکەم ، کوا ؟

ئەفەرموێ : کامەیە ؟

ئەڵێ : بایی دوو دیرهەم خواردن و ، ئەوەندە پێخۆر و ، سـێ دیرهـەم بـۆن خۆشـیی و ، دوو دیرهەم ئالیکێ بۆ ولاغەکەت و ، دوو دیرهەم کرێی نوێن و لێفەکە .

بە خزمەت گوزارەکەی ئەفەرموێ : رۆڵە ! بیدەرێ . هیچی ترت ماوە ؟

وتی : کرێی خانووەکە . تۆم حەساندۆتەوە و تەنگم بە خۆم هەڵچنیوە .

شافیعیی تێدەگات کە ناونیشانی کابرا بە پێی کتێبـەکان راست دەرچـوو . دوای ئـەوە دەپرسێ : هیچی ترت ماوە ؟

ئەڵێ ، برۆ ، خوا سەرشۆڕت بکات . خراپی وەک تۆم نەدیوە .[٢٤٨]

ئیمام شافیعیی رووداوی زۆری لێدەگێڕنەوە دەربارەی زانینی هەندێ شت کە زەننـی بـۆ دەروات .

بۆ نموونە : موزەنیی دەگێڕێتەوە : لە مزگەوتدا لە خزمەتی شافیعییدا بووم دەبینین وا پیاوێک هاتە ژوورەوە و بەسەر خەوتووەکاندا دەگەڕێ . شافیعیی بە رەبیعـی فـەرموو : هەستە بەو پیاوە بڵێ : ئایا بەندەیەکی قولەرەشت گوم کردووە کە چاوێکی لە دەست داوە؟ رەبیع هەڵدەستێ و پرسیار لە کابرا ئەکات و ئەویش ئەڵێ : بەڵێ .

کابرا دێتە خزمەتی شافیعیی و ئەڵێ : کوا بەندەکەم ؟ فەرمووی : بـڕۆ لـە بەندیخانـە دەیدۆزیتەوە .

کابرا چوو بۆ بەندیخانە و بەندەکەی دۆزییەوە .

---

[٢٤٨] آداب الشافعي ( ١٢٩ ) .

موزەنیی ئەڵێت : پێم وت : هەواڵمان بدەرێ ، سەرسامت کردووین . فەرمووی : بـەڵێ . چاوم لێ بوو کابرایەک لە دەرگای مزگەوت هاتە ژوورەوە و بە ناو خەوتووەکاندا دەگەڕێ . وتم : بە دوای هەڵاتووا دەگەڕێ . دەبینم سەرنجی رەشەکان دەگرێ نەک سـپی یەکان . وتم: بەندەیەکی قولەرەشی هەڵاتووە . چاویشم لێی بوو سەرنجی چاوی چەپیانی دەگـرت . وتم : هەڵاتووەکـە چاوێکی لـە دەسـتداوە . وتمـان : ئـەی چۆنـت زانیـی وا لـە بەندیخانــەدا ؟ فەرمووی : ئەو فەرموودەیـەی کـە دەربـارەی کۆیلـەکان دەفـەرموێ : ئەگـەر برسـیی بـوون دزیی دەکەن و ، گەر تێریش بوون زینا دەکەن ، تـەئویلم کـرد یـەکێکیانی ئـەنجام داوە و ، هەرواش بوو .[٢٤٩]

زانایان و خواناسان بە سەلیقەی جوانیان شتیان بۆ دەرکەوتووە .

جارێکیان لە صەنعاوە پیاوێک دێتە خزمەتی شافیعیی، کە دەیبینێ پێی ئەفـەرموێ : خەڵکی صەنعای ؟ ئەڵێ : بەڵێ . دەپرسێ : ئاسنگەری ؟ ئەڵێ : بەڵێ .

جارێکیان ئیمام شافیعیی و موحەممەدی کوڕی حەسەن بە جووتە لـە سـایەی کەعبــەدا دادەنیشن و پیاوێکیش لەوێوە تێپەڕ دەکات . یەکێکیان بە هاوەڵەکەی ئەڵێ : وەرە با بــەم پیاوەی کە دێت خۆمان تاقیی بکەینەوە . با بزانین چ پیشەیەکی هەیە ؟ یەکێکیان ئـەڵێ : بەرگ درووە . ئەوی تر ئەڵێت : دارتاشە . کە ناردیان بە دوایدا و پرسیاریان لێ کرد ، وتی: ئەوسا بەرگ درووە بووم و ئێستاش دارتاشم .

لە باسەکانی پێشەوەشدا باسی ئەوە کرا کە چۆن ئیمـام شـافیعیی باسـی دوارۆژی هـەر چوار قوتابی یەکەی دەکات .[٢٥٠]

ئیمام شافیعیی هەتا کۆتایی تەمەنی چارەی هەندێ سیفەتی نەدەویست وەک قـژی زەرد و چاوی شین .

رەبیع ی کوڕی سولەیمان ئەڵێت : بۆن خۆشــی یەکم بـۆ شـافیعیی بـە دینـارێک کڕیـی . لێمی پرسیی : لە کێت کڕیی ؟ وتم : لەو قژ زەردە . فەرمووی : قژی زەرد و چـاوی شـین . بی بەرەوە ، بی بەرەوە ![٢٥١]

هەروەها رای وا بووە کە عـەقڵ و قەڵەویی پێکەوە ناگونجێن ، بۆیە دەیفەرموو : جگە لە تاقە پیاوێک هیچ قەڵەوێکم نەدیوە کە عاقڵ بێت .[٢٥٢]

---

[٢٤٩] توالي التأسيس ( ٦٦ ) .

[٢٥٠] سەیری لاپەڕە (٥٢)ی ئەم نووسراوە بکە .

[٢٥١] آداب الشافعي ( ١٣١ ) .

لە پاڵ هەموو بەشەکانی زانستدا ئیمـام شـافیعیی شـارەزایی‌یەکی چـاکی لـە زانسـتی پزیشکیی‌دا هەبووە . چونکە بە زانستێکی بەکەڵکی زانیـوە بـۆ تەندروسـتیی موسـڵمانان و بە هاوتای زانستە شەرعی‌یەکانی لە قەڵـەم داوە ، چونکـە شـەرع فریـای قیامـەتی خـەڵک دەکەوێت و پزیشکییش فریای لاشەیان دەکەوێت .

ئەوەتا ئەفەرموێ : « زانست دوو زانستە : زانستی دین و ، زانستی دنیـا . جـا زانسـتی دین بریتی‌یە لە : فیقهـ و ، زانستی دنیاش بریتی‌یە لە زانستی پزیشکیی » .[253]

هەروەها دەفـەرموێ : « دوای زانسـتی حـەڵاڵ و حـەرام زانسـتێکی تـر پـێ نـازانم لـە زانستی پزیشکیی بەرێزتر بێت ، بەڵام ئەوەتا ئەهلی کیتاب لە ئێمەیان سەندووە » .[254]

لە هەمان کاتدا زانستی پزیشکیی بە سێیەکی زانست لە قەڵەم دەدات و ، زۆریش بـە داخەوەیە کە موسڵمانان دەستبەرداری بوون و بە گاور و جوولەکانیان سپاردووە .[255]

هەروەها دەری دەبڕێ کە دوو شتی گرنگ هەن کـە خـەڵکیی پشـتگوێیـان خسـتوون : زمانی عەرەبیی و پزیشکیی .[256]

لەبەر ئەمە ئیمام شافیعیی خۆی بایەخێکی چاکی بە پزیشکیی داوە ، بە رادەیـەک کـە رەبیع ی قوتابیی وەها باسی دەکات کە تەواو شارەزای پزیشکیی بووە .[257]

بگرە پزیشکێکی میصریی شاهێدیی لەسەر زانستی شافیعیی دەدات کـە وەهـا شـارەزا بووە وەک ئەوەی تەنها ئەو زانستە بزانێ و هیچی تر .[258]

## ( ٨ ) نووسینی شافیعیی :

پێش شافیعیی هیچ ئیمامێک چ لە ئوصوول و چ لە فرووعدا و ، چ لە فیقهـ و ، چ لە تەفسیردا ئەوەندەی شافیعیی کتێبی نەنووسیوە .

ئیبن زولاق وتوویە : شافیعیی نزیکەی دوو صەد جوزء کتێبی داناوە .[259]

---

[252] آداب الشافعي ( ١٣٢ ) ئەو پیاوەش موحەممەدی کوڕی حەسەن بووە وەک لە ( روض الأخبار ) دا دەری بڕیوە .

[253] آداب الشافعي ( ٣٢١ : ٣٢٢ ) .

[254] آداب الشافعي ( ٣٢١ ) .

[255] آداب الشافعي ( ٣٢١ ) .

[256] آداب الشافعي ( ٣٢١ ) .

[257] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٥ ) .

[258] توالي التأسيس ( ٦٦ ).

[259] شذارات الذهب ( ٢ : ١٠ ) .

قاضیی ئیمام ئەبو موحەممەد حەسەنی کوڕی موحەممەد میروەزییش وتوویە : وتراوە کە : شافیعیی ـ رەحمەتی خوای لێ بێ ـ لە تەفسیر و فیقهـ و ئەدەب و شتی تردا سەد و سیانزە کتێبی نووسیوە .[٢٦٠]

بە مەرجێ لە نووسیندا زۆر گورج و گۆڵ بووە کە لە نیوەی رۆژێکدا کتێبێکی نووسیوە . یوونسی کوڕی عەبدولئەعلا وتوویە : شافیعیی لە بەیانیەوە تا نیوەڕۆ کتێبێکی دادەنا .[٢٦١]

بەڵێ ، سەیر لەوەدایە کە ئەم هەموو کتێبانەی نووسیوە و تەمەنیشی لە پەنجا و چوار ساڵ زیاتر نەبووە .

موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی راهوویە ئەڵێت : لە باوکم پرسیار کرا : شافیعیی ، کە تەمەنی زۆر نەبوو ، چۆن ئەم هەمووە کتێبەی داناوە ؟ گوێم لێ بوو دەیوت : بە بۆنەی کورتیی تەمەنیەوە خوا عەقڵی بۆ پێش خست .[٢٦٢]

جا لێهاتوویی شافیعیی و فەر و بەرەکەتی تەمەنی و ، ژیریی و بلیمەتیی و رۆح سووکیی و غیرەتی لەوەدا دەردەکەوێ کە زۆربەی ئەو هەمووە کتێبانەی لە دەیەکی کۆتایی تەمەنیدا ، لەو ماوەیەدا کە لە میصر بووە ، کە ماوەی چوار ساڵ بووە ، نووسیوە ، سەرەڕای ئەو نەخۆشیە سەختە بەردەوامەی کە پێوەی گیرۆدە بوو بوو .

رەبیع ئەڵێت : شافیعیی ماوەی چوار ساڵ لێرەدا مایەوە کە هەزار و پێنج صەد وەرەقە کتێبی نووسیی و ، کتێبی ( الأم ) ی لە دوو هەزار وەرەقەدا نووسیی و هەروەها کتێبی (السنن) و شتی تری زۆریشی نووسیی . ئەمە هەر هەمووی لە ماوەی چوار ساڵدا و ، نەخۆشیش بوو ، بەڵام نەخۆشیەکی سەخت ، بە رادەیەک کە سواری وڵاغ دەبوو شەرواڵ و خوففەکانی لە خوێن پڕ دەبوون .[٢٦٣]

دەربارەی چۆنێتیی نووسینی شافیعیەوە ، لە رێی حەرمەلەوە حاکم تەخریجی کردووە کە وتوویە : شافیعیی لەلای ئەم کۆڵەکەیەی مزگەوتدا دادەنیشت و پارچە مەخمەڵێکی

---

[٢٦٠] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٣ ) .
[٢٦١] توالي التأسيس ( ٧٧ ) .
[٢٦٢] توالي التأسيس ( ٧٩ ) .
[٢٦٣] توالي التأسيس ( ٨٣ ).

ناسکی بۆ رادەخراو بەسەر دەم و چاویا دەچەمایەوە ـ چونکە نـەخۆش بـوو ـ و دەسـتی بـە نووسین دەکرد . ئەوە بوو ئەم کتێبانەی لە ماوەی چوار ساڵدا نووسین .[٢٦٤]

رەبیع یش وتوویە : ئەوەندە جار کە لە ژمارە نەیەن چاوم لـە شـافیعیی بـووە ، کـە لـە نوێژ دەبوویەوە عەباکەی بەسەر شانیدا دەدا و ، چرایەکی بچکۆلـەی بـۆ دادەنرا و ، خـۆی بەسەر پشتییەکێدا دەدا و ، دوو پارچە قوماشی موضەریی لە ژێریدا دەبـوون و ، دەسـتی دەدایە قەڵەم و هەرخەریکی نووسین بوو .[٢٦٥]

جاری وایش دەبوو دەچووە جێگاوە بـۆ خـەوتن ، کـەچیی لـە ناکـاودا مانـا یـان فیقـهی فەرموودەیەکی وە بیر دەهاتەوە و ، لە ترسی ئەوەی نەوەکو لە بیری بچێتەوە هـەڵ دەسـتا و، چرایان بۆ دادەگیرساند و دەستی بە نووسین دەکرد ..

حومـەیدیی ـ کـە یـەکێ لـە قوتابییـەکانی مەککـەی بـووە و ، بـەرەو میصریش لـە خزمەتیا رۆیشتووە ـ ئەڵێت : لەگەڵ شافیعییدا بەرەو میصر کەوتینە رێ و ، لەوێ ئەو لـە نهۆمی سەرەوە نیشتەجێ بوو و ، ئێمەش لە ناوەڕاستدا . جاری وا دەبـوو شـەو دەچوومـە دەرەوە چرام دەبینی ، کە بانگم لە خزمـەتکارەکـە دەکرد ، خـۆی دەنگمی دەبیسـت و ، دەیفەرموو : وەرە سەرکەوە . کە سەردەکەوتم ، دەبینم وا کاغەز و دەواتی لەبـەر دەسـت دایە . دەم وت : ئەبوعەبدوڵلا ! ئەمە چییە ؟ دەیفەرموو : بیرم لە مانای فەرموودەیـەکێ ـ یان مەسەلەیەکێ ـ کردەوە و دەترسام لـە بـیرم بچێتـەوە ، بۆیـە فـەرمانم دا چراکـەم بـۆ داگیرسێنن و ، نووسیم .[٢٦٦]

دوای ئەوەش کە کتێبێکی دەنووسیی ، ئیتر سا لە سەرچاوە وەری دەگرت ، یان لەبـەر دەینووسیی ، ئیبن هەرەم ـ کـە هەمیشـە لـە خزمـەتیا بـوو ـ دەهـات و بووەیطـیی بـۆی دەخوێندەوە و ئامادەبوانیش گوێیان لێ دەگرت و ئەویش پاکنووسی دەکـرد و دوای ئـەوە چەندین نوسخەیان لەبەری دەنووسییەوە ..[٢٦٧]

جا لەبەر ئەوەی کە شافیعیی خاوەنی تەقوا و ئیخلاصێکی کەم وێنە بوو ، خوای گەورە خۆشەویستیی کتێبەکانی ئەوی بردە دڵی زانایانی ئیسلامەوە ، بۆیە حەزیان لە نووسـین و بیستنی کتێبەکانی هەبوو و ، هەرکەسە هەوڵی دەدا کتێبێ زیاتری دەسـت بکـەوێ . ئـەوە

---

[٢٦٤] توالي التاسيس ( ٧٨ ) .

[٢٦٥] تهذيب الأسماء ( ١ : ٦٦ ) .

[٢٦٦] آداب الشافعي ( ٤٤ ) .

[٢٦٧] توالي التأسيس ( ٧٧ ) .

بوو جارێکیان دوای مردنــی ئیمـام شـافیعیی نۆصـەد ولاغـی سـواریی لەبـەردەم ماڵەکـەی ڕەبیعی کوڕی سولەیماندا ـ کە خزمەتگوزار و قوتابیی و ڕیوایەتکەری کتێبەکانی بـوو ـ وەستان و هەر یەکەیان دەیویست بچێتە لای ڕەبیع و زانستی شافیعیی لێوە ببیستێ .[٢٦٨]

ئیمام ئەحمەدیش لە باسی فەزڵی شافیعیی لەسەر هەموو زانا و نووسەرێک ئەفەرموێ: هەرکەسێ دەستی لە قەڵەم و دەوات دابێ وا لە ژێر منەتی شافیعییدا و قەرزاریەتی .[٢٦٩]

حەرمەلەش ئـەڵێت : بـاوکم نووسـەرێکی بـۆم بـەکرێ گرتبـوو و پێیشـی وتبـوو : هـەر وتەیەک لە دەم شافیعیی دەردەچێ تۆ بینووسە .[٢٧٠]

موحەمـمەدی کوڕی عـەلیی کوڕی مەدینیی ئەڵێت : بـاوکم پێمـی وت : دەسـتبـەرداری پیتێک لە کتێبەکانی شافیعیی نەبی و هـەمووی بنووسـە .[٢٧١] جـا موحەممـەد ئـەیوت : دەستبەرداری پیتێکی کتێبەکانی شـافیعیی نـابم و هـەمووی ئەنووسـم ، چونکـە زانسـتی تێدایە .[٢٧٢]

ئەحمەدی کوڕی سـەلەمەی نەیسـاپووریی ئـەڵێت : ئیسـحاقی کـوڕی ڕاهوویـە ژنێکـی مارە کرد کە ئەو ژنە هاوسەری پیاوێک بوو بوو کە کتێبەکانی شافیعیی بـەلاوە بـوون و ، کۆچی دوایی کردبـوو تەنـها لەبـەر کتێبـەکانی شـافیعیی مـارەی کـرد . ئـەوە بـوو کتێبـی (الجامع الكبير ) ی لەسەر کتێبەکانی شافیعیی دانا ..[٢٧٣]

ئیمام شافیعیی دەیویست لـەڕێی خـوادا زانسـتی شـەرعیی بـڵاو بکاتـەوە ئیـتر بـاکی نــەبوو لـەوەی کە ئەو زانستە بە ناوی خۆیـەوە بڵاو بێتەوە یان نەء ، بۆیە دەی فـەرموو : (( ما أبالي لو أن الناس كتبوا كتبي وتفقهوا بها ، ثم لم ينسبوها إلي )).[٢٧٤] ئەوە بـوو خـوای گەورە بەدڵی ئەوی کرد و کتێبەکانی بڵاو بوونەوە .

دڵگەرمبوونی زانایان بۆ وەرگرتنی زانستی شافیعیی و بڵاوکردنەوەشی، دەگەڕێتــەوە بـۆ ئـەو ئیخلاصـەی کـە خـوا لـە دڵیـا دروسـتی کردبـوو . هـەروەها هـەرگیز نـاو و ناوبـانگی نەویستووە ، بۆیە بەرابەرکێی بۆ سەرکەوتن و بردنـەوە نـەبووە ، بـەڵکو ئـاواتی خواسـتووە

٢٦٨ تهذيب الأسماء ( ١ : ٤٨ ) .
٢٦٩ توالي التأسيس ( ٥٧ ) .
٢٧٠ تهذيب الأسماء ( ١ : ٦٠ ) .
٢٧١ تهذيب الأسماء ( ١ : ٦٠ ) .
٢٧٢ توالي التأسيس ( ٥٧ ) .
٢٧٣ توالي التاسيس ( ٧٦ ) .
٢٧٤ توالي التأسيس ( ٧٦ ) .

خەڵكیی هەر هەموو ئەو زانستەی ئەویان بزانیایە با هیچ كەس ئەو زانسـتەی بـە هـی ئـەو نەزانیایە كە دەفەرموێ :

« ما ناظرت قط علي الغلبة ، وبودي أن جميع الخلق تعلموا هذا الكتـاب ، فـلا ينسب إلي منه شيء » .[٢٧٥]

ئەبوئەحمەدی كوڕی عەدیی كە عەبدوڵڵای كوڕی عەدیی كوڕی عەبدوڵڵای جورجانی‌یـە و بە ( ابن القطان ) ی حـافیظی گـەورە ناسـراوە و ، یەكێكـە لـەو كەڵەزانایانـەی كـە لـە ناسینی فەرمووده و پیاوانی‌دا رای وەردەگیرێت و ساڵی ( ٣٦٥ ) ی كۆچیی كۆچـی دوایـی كردووە، دەگێڕێتەوە : لە ئەبوبـەكری كـوڕی ئـەبوحامیدم بیسـت ، كـە بەڕێوەبـەری ( بيـت المال ) ی میصر بوو ، دەیوت : لە مەجلیسی ( ابن الفـرات )[٢٧٦] دا دانیشتبووین و ئەبوموسای ضەریریشمان لەگەڵ دا بوو ، كە ئەو رۆژە گـەورە مامۆسـتای ئـەهلی ( رأي ) بوو ، ( ابن الفرات ) بە ئەبوموسای وت : لە بـارەی دووپیـاوەوە پرسیارت لێ دەكـەم و تۆش وەڵامم بدەرەوە .

وەزیر وتی : یەحیای كوڕی ئەكثەم ئینكاریی زانستی ناكرێت و ، دەش‌زانی چـەندە لای خەلیفـە لـە پێشـەوەیە ، بـە رادەیـەك كـە مـەئموون لەگـەڵ خـۆی‌دا مـاوەی دەدا شـوێنی خەوتنیشی ببینێ و ، كتێبی داناون و ، ئینكاریی زمان پاراویی و زانیارییشـی نـاكرێت ، كەچیی وا پێ نازانم كە دووكەس بە گوێی بكەن . ئەوەش شافیعی‌یە كە بە هـەژاریی هاتـە عیراقەوە و ، لەلای خەلیفـەش هیـچ پلەیـەكی نیـە . ئـەویش كتێبـی دانـاون و، وا دەبینـم هەموو رۆژێ ناوی بەرزتر دەبێتەوە و، خەڵكیی زیاتریش لە دەوری كتێبەكانی كۆدەبنەوە ..

ئەبوموسا بۆ ماوەی سەعاتێك هەر بیری دەكردەوە ، پاشان وتـی : ئـەڵێم : شـافیعیی بەم زانستەی مەبەستی خوا بووە ، بۆیە خوایش بەرزی كردەوە ..[٢٧٧]

ئەمە كلیلی سەركەوتنە بۆ موسڵمانان : كار بـۆ رەزامـەندیی خـوا بكـەن .. گرنـگ نیـە ئەوكارە ناودار بێ یان نەء .. گەورە بێت یان بچووك !!

ئیخلاص و پاكیی نییەتی ئیمام شافیعیی لە رادەیەكدا بوو كە زانستەكەی لـە هـەموو سەرزەوی‌دا بڵاوە بكات .

---

[٢٧٥] توالي التأسيس ( ٧٦ ) .

[٢٧٦] ناوی عەلیی كوڕی موحەممەدی كـوڕی موسـایە . وەزیرێكـی زۆرزانـی زمـانپاراوی ئـەدبیی سـەخیی بـووە . لـە سەردەمی ( المقتدر ) دا سێجار پۆستی وەزیریی وەرگرتووە و لە (٣١٢) ی كۆچیی‌دا كوژراوە .

[٢٧٧] توالي التأسيس ( ٧٦ ) .

رەبیع ئەڵێت : لە شافیعییم بیست کە دەیفەرموو : « لە خەومدا کەسێکێ هاتــە لام و، کتێبەکانمی هەڵ گرتــن و ، دانـی بـە دەم بـاوە و ، ئـەوانیش بـە ئاسمـانـدا پـەرش و بـڵاو بوونەوە . کە خەوەکەم بۆ یەکێ لە لێکدەرەوانی خەو گێڕایەوە ، وتی : ئەگەر ئەم خــەوەت بێتە دیی ، زانستەکەت دەگاتە هەموو وڵاتێکێ لە وڵاتانی ئیسلام ».[278]

ئیمام شـافیعیی گـەلێکێ مامۆسـتای هـەبوون و ، لـە هـەموو کەسیش زیـاتر قوتـابیی هـەبوون کـە چـەندین کەڵـەزانایان لێ هەڵکـەوتن کـە بەشـی زۆریـان مامۆسـتای ئیمامـــە ناودارەکان بوون ، بە تایبەت مامۆستای شەش ئیمامی دانەری ( الصحاح الستة ) .[279]

## ( ٩ ) زانایان و ستایشی ئیمام شافیعیی :

خوای گەورە بە سۆزی بەلێشاوی وەهای بۆ شافیعیی هێنایە پێش کـە لـە سـەردەمێکی ناوازەدا بژیـت .. لـەو سـەردەمەدا کـە ئوممـەتی ئیسـلام بەخەبـەر هـاتبوون و لـە هـەموو بوارێکی زانستدا لە پێش برکێدا بوون . ئا لـەو سـەردەمە پـڕ بەختەوەرییـەدا مێـژوو بـە ژیرانە کاری سەرشـانی خۆی ئـەنجام دەدا .. رێـز لـەی پیـاوی پیاوانـەی خزمـەتگـوزاری خاوەن زانست و رەوشت بەرز و بەتـەقوا دەگـیرا .. پایـە بـۆ خواناسـان دادەنـرا .. قیامـەت سەنگی مـەحەکێ بوو بە لای کۆمەڵــەوە .. بۆیـە کەڵـەزانای پایـەدار هـەر چوار ئیمامـەکـە بوون، کە رێزی تایبەتییان لێ دەگیرا و خۆشەویستی ناو کرۆکی دڵی موسـڵمانان بـوون و ، ئوممـەتی ئیســـلامیش تەوپـــەڕی ستایشـــی دەکـــردن و ، زانـــا پایـــەدارەکانیش وەســفی راستەقینەی ئەوانیان دەکرد .

جا هەرچەندە لە پێشەوە ستایشی هەندێ لە مامۆستایان خرایـە پێـش چـاو ، وا چاکـە لێرەشدا هەندێکی تر باس بکەین :

فەضلی کوڕی دەکین ، کـە زانایـەکی پایەبـەرز بـووە و لـە سـاڵی (٢١٩) ی کۆچییـدا کۆچی دوایی کردووە ، وتوویە :

« ما رأينا ولا سمعنا أكمل عقلاً ، ولا أحضر فهماً ، ولا أجمع علماً من الشافعي » .[280]

---

[278] توالي التأسيس ( ٥٢ ) .

[279] سەرنجی کتێبی ( الإمام الشافعي ) دانراوی مامۆستا ( عبدالغني الدقر ) م دا دەبینم پەنجا و چوار قوتابیی ئیمام شافیعیی مامۆستای ئەو شەش ئیمامە بوون . ل ٣٢٥ ـ ٣٣٦ .

[280] توالي التأسيس (٥٩) .

( ابو الثور ) یش وتوویه : هەرکەس وادەربــبڕێ کـه لـه زانسـت و ، زمـان پـاراوی و ، زانین و ، دامەزراویی و ، لێهاتن‌دا پیاوی وەك موحەممەدی کوڕی ئیدریسی دیوه ئەوه درۆی کردووه ، بە راستیی تا له ژیان‌دا بوو هاوتای نەبوو و ، كه چوویش به رێــی خۆیــەوه کەس شوێنەکەی پڕ نەکردەوه .[٢٨١]

کـاتێکیش کـه فـەرموودەی ئامۆژگـاریی بـۆ خوێندرایـەوه و لەسـەر خـۆی چــوو ، بـە سوفیانی کوڕی عویەینـەی مامۆسـتای وتـرا کـه لەوانەیـه شـافیعیی مردبـێ ، ئـەویش لـه وەڵامدا وتی : ئەگەر مردبێ ، ئەوا چاکترین پیاوی سەردەمی خۆی مردووه .[٢٨٢]

هاروونی کوڕی سەعیدی ئەیلیش ، که یەکێك له مامۆستایانی موسلیم بووه ئـەڵێت : پیاوی وەك شافیعییم نەدیوه .[٢٨٣]

ئەبومەنصووری ئەزهەرییش ، که له ساڵی ( ٣٧٠ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووه ، دەری دەبڕێ که هیــچ فەقیـهێکی نـەدیوه ئـەوەندەی شـافیعیی زانسـتی زۆرتـر و ، زمـانی پاراوتر و ، خوربەی دڵی فراوان تر بێت که ئەڵێت : « عكفت على المؤلفات التي الفها فقهاء الأمصار ،فألفيت الشافعي أغزرهم علماً ، وأفصحهم لساناً ، وأوسعهم خاطراً » .[٢٨٤]

ئەبوعوبەید قاسمی کوڕی سەلام یش وتوویه : کەسم نەدیوه له عـاقلیی و ، له وەرەع و ، له زمان‌پاراویی و ، له رای دروست‌دا له شافیعیی زیاتر بێت .[٢٨٥]

هەروەها وتوویه : هێشتا پیاوێکم نەدیوه له شافیعیی کامڵتر بێت .[٢٨٦]

زەعفەرانییش دەری بڕیوه که پیاوی نەدیوه له شافیعیی چاکتر و بــەڕێزتر و سـەخییتر و بەتەقواتر و زاناتر .[٢٨٧]

بیشری موریسییش وتوویه :« ما رأيت أمهر من الشافعي » .[٢٨٨]

---

[٢٨١] وفيات الأعيان ( ١ : ٥٦٦ ) .

[٢٨٢] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٩ ) .

[٢٨٣] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٢ ) .

[٢٨٤] توالي التأسيس (٦٢ ) .

[٢٨٥] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦١ ) .

[٢٨٦] وفيات الأعيان ( ١ : ٥٦٥ ) .

[٢٨٧] توالي التأسيس (٥٥ ).

[٢٨٨] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٣ ) .

ئیمام ئەحمەدیش دەری دەبڕێ کە هیچ کەس ئەوەندەی شـافیعیی لـە زانسـتدا هەڵـەی کەم نەبووە و ، هیچ کەسیش ئەوەندەی ئەو بە توندیی دەسـتی بـە سـوننەتی پێغەمبـەرەوە ﷺ نەگرتووە .[٢٨٩] هەروەها فەرموویە : « ما رأيت أفصح منه ، ولا أفهم للعلوم منه» .[٢٩٠]

ئیسحاقی کوڕی راهوویەش ، کە سەرەتا بەرابەرکێی لەگەڵ شافیعییدا دەکرد ، ئـەڵێت : « الشافعي إمام العلماء ، وما يتكلم أحد بالرأي إلا والشافعي أقل خطـــأ منـــه » .[٢٩١]

هەروەها وتوویە : « الشافعي إمام » .[٢٩٢]

یەحیای کوڕی سەعیدیش ناوی شافیعیی دەبات و ئەڵێت : کەسم نەدیوە لـە شـافیعیی عاقڵ تر و فەقیهـ تر بێت ) .[٢٩٣]

حومەیدییش ناوی شافیعیی بە ( سيد الفقهاء ) و ( سيد علماء زمانه ) دەبرد .[٢٩٤]

ئەییووبی کوڕی سووەیدی رەملیـیش ، کـە یـەکێ بـووە لـە مامۆستایانی شـافیعیی و یانزە ساڵیش پێش ئەو کۆچی دوایی کردووە ، ئەڵێت : بە بیرمدا نەهاتووە کە مـن دەمێنـم هەتا پیاوی وەک شافیعیی ببینم .[٢٩٥]

جونەیدیش ئەڵێت : «كان الشافعي من المريدين الناطقين بلسان الحق في الدين ».[٢٩٦]

موحەممەدی کوڕی حەسەنیش کە گەورە قوتابیی ئیمام ئەبوحەنیفە بووە یـەکجار رێـزی لە شافیعیی گرتووە . ئەبوحەسسان ئەڵێت : نەمدیوە موحەممـەد ئـەوەندەی شـافیعیی رێـز لە هیچ کەس بگرێت .[٢٩٧]

موعـەممەری کوڕی شەبیب یش ئەڵێت : گوێم لە مـەئموون بـووە وتوویـە : لـە هـەموو شتێکدا موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعییم تاقیی کردۆتەوە و بـە کـامڵ هاتـە پێـش چاوم .[٢٩٨]

---

[٢٨٩] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٠ ) .
[٢٩٠] توالي التأسيس (٥٧ ) .
[٢٩١] تهذيب الأسماء واللغات (١ : ٦١ ) .
[٢٩٢] توالي التأسيس ( ٥٧ ) .
[٢٩٣] توالي التأسيس (٥٥ ) .
[٢٩٤] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٢ ) .
[٢٩٥] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٩ ) .
[٢٩٦] توالي التأسيس (٦١ ) .
[٢٩٧] توالي التأسيس ( ٧١ ) .
[٢٩٨] توالي التأسيس ( ٥٦ ) .

ئەمە کەمێکێ لە ستایشی گەورە زانایانی سەردەمی خۆی بوو ، هەروەها زانایانی دوای خۆیشی ستایشیان کردووە :

ئەحمەدی کوڕی سەییار ، کە بە هاوتای عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکێ لە قەڵــەم دراوە و ، لە ساڵی ( ٢٦٨ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایـی کـردووە ، دەری بڕیـوە کـە ئەگـەر شـافیعیی نەبوایە ئیسلام تیا دەچوو کە ئەڵێت : « لولا الشافعي لدرس الإسلام » .[٢٩٩]

ئیبراهیمی کوڕی ئیسحاقی حەربییش ئەیوت : مامۆسـتای مامۆسـتایان فەرموویـە : کە پێی دەوترا : کێیە ؟

ئەیوت : شافیعیی . ئەی مامۆستای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نیە ؟[٣٠٠]

ئەبوزەرعەش وتوویە : پێ نازانم هیچ کەس لە شـافیعیی زیـاتر منـەتی بەسـەر ئـەهلی ئیسلامەوە هەبێ .[٣٠١]

ئەبوحاتەمی رازییش وتوویە : شافیعیی هاوناوی منە و ، باوکیشی هاونـاوی باوکمـە . ( ئەویش ناوی موحەممەدی کوڕی ئیدریس بووە ) . ئەگەر ئەو نەبوایە زانایانی فـەرموودە هەر بە کوێریی دەمانەوە .[٣٠٢]

ئـەبو عـەبدوڵڵای بوشـەنجیی شـافیعییش ، گـەورە مامۆسـتای زانسـت دۆسـتانی نەیساپوور، کە لە ساڵی ( ٢٩٠ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایـی کردووە ، دەری بڕیـوە کـە بـە وردیـی سـەرنجی پیـاوانی ئیسـلامی داوە و دوای چـەرخی یەکـەمی ئوممـەتی ئیسـلام کەسێکی نەدیوە کە لە شافیعیی پایەدارتر و ، روونکردنەوە چاکتر و ، زمان پاراوتر بێـت، سەرەڕای خزمایەتییشی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ .[٣٠٣]

داوودی کوڕی عەلیی ئەصبـەهانییش ـ کـە پێشـەوای مەزهـەبی ظاهیریـیە ـ ئـەڵێت : کۆمـەڵێکێ رەوشتی جوان لە شافیعیی‌دا کۆ بوونەتەوە کە لە کەسانی تـردا کۆنەبوونەتـەوە . یەکەم رەوشتی ئەمەیە :

شەرەفـداریی نەسەب و پایە و پلەی و ، لە خزم و کەس‌وکاری پێغەمبەریشە ﷺ .

یەکێ تر لەوانە : دروستیی دینی و ، سەلامەتیی عەقیدەی لە هەوابازیی و بیدعەت .

---

[٢٩٩] توالي التأسيس ( ٦٢ ) .

[٣٠٠] توالي التأسيس ( ٦١ ) .

[٣٠١] توالي التأسيس ( ٦١ ) .

[٣٠٢] توالي التاسيس (٦١ ) .

[٣٠٣] توالي التأسيس ( ٦١ ) .

یەکێ تر لەوانە : سەخاوەتی دڵ و دەروونی .

یەکێ تر لەوانە: ناسینی فەرموودەی صەحیح و نەخۆش ، هەروەها ناسیخ و مەنسووخ .

یـەکێ‌تر لەوانـە : لەبـەر کردنـی قورئـانی پـیرۆز و ، شـارەزایی لـە هـــەواڵ و مێــژووی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئاگادراریی لە سیرەتی پێغەمبەر ﷺ و سیرەتی خەلیفەکانی .

یەکێ تر لەوانە : دەرخستنی ناتەواویی ناحەزانی و ، دانانی کتێب .

یەکێ تر لەوانە : هەڵکەوتنی کۆمەڵە قوتابیی و هاوەڵێکی بۆی ، وەکو ئەحمەدی کـوڕی حەنبەل لە زوهد و زانست و جێبەجێ‌کردنی سوننەتدا و ، وەکو سولەیمانی کوڕی داوودی هاشمیی و ، حومەیدیی و، کەرابیسیی و ، ئەبوثەور و ، زەعفەرانیی و ، بووەیطـــیی و ، ئەبولوەلیدی کوڕی ئـەبولجاروود و ، حەرمەلـە و ، رەبیـع و ، حـاریثی کـوڕی سـورەیج و ، سەروکاریی‌کەری مەزهەبەکەی ئەبوئیبراهیمی موزەنیی .[٣٠٤]

هەروەها داوودی کوڕی عەلیی ، دوای ئەوەی کە باسـی مەسـەلەیەکێ دەکـات ، وەسـفی شافیعیی دەکات کە لێکدانەوەی ئەو مەسەلەیە قەولی ئەوە : ( هـــذا قـــول مطلبيّنـــا الشافعي الذي علاهم بنكته ، وقهرهم بأدلته ، وباينهم بشهامته ، وظهر علیـــهم بحمازتـــه ، التقي في دينه ، النقي في حسبه ، الفاضل في نفسه ، المتمسك بكتاب ربه ، المقتـــدي قـــدوة رسوله ، الماحي لآثار أهل البدع ، الذاهب بجمرهم ، الطامس لسنتهم ، فأصبحوا كما قـــال تعالى : ﴿ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقْتَدِرًا ﴾ ) .[٣٠٥]

هیلالی کوڕی عـەلائی رەققییـش وتوویـە : خـوای گـەورە بـە ( بـەدیی‌هێنانی ) چـوار کەس ـ هەر یەکە لە سەردەمی خۆیاندا ـ بەخششی خۆی بەسەر ئەم ئوممەتەدا رژاند : بە شافیعیی بە شارەزایی لە فیقهی فەرموودەی پێغەمبەری خـوا ﷺ و ، بـە ئیمـام ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل لـە تاقیی‌کاری‌یەکـەیدا ، چونکـە ئەگـەر وا نەبوایـە خەڵکەکـە ئیمانیـان لـە دەست دەدا و ، بە یەحیای کوڕی موعین بە پـاکێ‌کردنـەوەی فـەرموودەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە درۆ هەڵبەسـتن و ، بـە ئەبوعوبـەیدی قاسـم ی کـوڕی سـەلام بـە تەفسـیرکردنـی فەرموودەی غەریبی پێغەمبەری خوا ﷺ ، چونکـە ئەگـەر وا نەبوایـە خـەڵکیی بـە هەڵـەدا دەچوون .[٣٠٦]

---

٣٠٤ توالي التأسيس ( ٦١ ) .

٣٠٥ توالي التاسيس (٦١ ) .

٣٠٦ نزهة الألباء ( ١٣٩ ) .

## ( ١٠ ) ستایشی هەندێ لە زانایان :

یەکەم کەسێک کە بە لای شافیعی‌یەوە گەورە و بەڕێز بوو بێت مامۆستای پایەبەرز ئیمام مالیک بووە . دوای ئەویش ڕێزی تایبەتیی بۆ سوفیانی کوڕی عویەینە دادەنا کە ئەوە بوو لە تەمەنی پانزە ساڵی‌یەوە ئامادەی دەرسەکانی دەبوو و ، زانستێکی چاکی لێ وەرگرت .

هەروەها یەکێ لەوانەی کە بە لایەوە زۆر بەڕێز بوون موسلیمی کوڕی خالیدی زنجیی بوو کە یەکەم مامۆستای بوو و لە مەککەدا فیقهی بە لایەوە خوێند و ، دەربارەشی دەیفەرموو : « موسلیمی کوڕی خالیدی زنجیی فەقیهی سەردەمی خۆی بوو » .

هەروەها ڕێزێکی زۆری لە تابیعیی بەناوبانگ و موفتیی و زانای فەرموودەی مەککە ، عەطائی‌کوڕی ئەبوڕەباح دەگرت ، ئەگەرچیی بە خزمەتیشی نەگەیشتبوو [٣٠٧] کە دەیفەرموو : « لە ناو تابیعی‌یان‌دا کەسێک نیە لە عەطاء زیاتر شوێن‌کەوتەی فەرموودە بێت ». [٣٠٨]

هەروەها ستایشی زۆرێک لە زانا بەڕێزەکانی عیراق و میصری دەکرد ، بە تایبەت ئیمام ئەحمەد چونکە ئەو خاوەنی چەندین سیفەتی بەرز بوو ، کە دەیفەرموو : « کە لە بەغداد دەرچووم لە ئەحمەد فەقیهـ تر و ، واریعتر و ، زاهیدتر و ، زاناترم تیایا بەجێ نەهێشت » . [٣٠٩]

لە هەمان کات‌دا ستایشی زانایانی فەرموودە و فەقیهەکانی عیراقی دەکرد ..

لە بارەی شەعبی‌یەوە دەیفەرموو : « لە زۆر ریوایەت‌کردنی فەرموودەدا شەعبیی وەک عوروەی کوڕی زوبەیر وەهایە » . [٣١٠]

وەهایشی دەبینی کە شوعبەی کوڕی حەججاج کە ئەمیری فەرموودە بوو و لە ساڵی ( ١٦٠ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردبوو ، دەورێکی گرنگی هەبووە بۆ بڵاوکردنەوەی فەرموودە و ، دەست‌کۆتاکردنیش بەوانەی کە شیاوی گێڕانەوەی فەرموودە نەبوون .

---

[٣٠٧] چونکە لە ساڵی ( ١١٤ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

[٣٠٨] آداب الشافعي ( ٢٠٦ ) .

[٣٠٩] الطبقات الكبرى ( ١ : ٢٧ ) .

[٣١٠] آداب الشافعي ( ٢٠٨ ) .

ئەفەرموێ : « ئەگەر شوعبە نەبوایە فەرموودە لە عیراقدا نەدەناسـرا . ئـەوە بـوو دەهاتـە لای کابرا ( کە شیاوی گێڕانەوە نەبوو ) و پێی دەوت :

فەرموودە نەگێڕیتەوە ، دەنا لای کاربەدەستان شکاتت لێدەکەم » .[٣١١]

جـا وەکێ ستایشـی شـوعبەی دەکـرد لـە سـەر شـارەزایی لـە فـەرموودەدا و ، لەسـەر وەرەعـی، لـە هـەمان کـاتدا رەخنەشـی لێ دەگـرت کـە لـە قیـاسدا لاوازە . بگـرە بـە نموونەش دەهێنرایەوە .

رەبیع ی کوڕی سولەیمان ئـەڵێت : « ئەگـەر کەسـێک لـە قیـاسدا هەڵـەی بکردایـە ، شافیعیی دەیفەرموو : ئەمە قیاسی شوعبەیە ».[٣١٢]

شافیعیی هەرچەندە لەگەڵ فەقیهەکانی ئەهلی ( رأي ) عیراقدا بەرابەرکێی هـەبوو و ، پەرچی زۆرێک لە بۆچوونەکانیانی دەدایەوە ، لە هەمان کاتدا زۆر رێزی لێ دەگرتـن و بـە سەنگین سەیری دەکردن ، ئەمەش لـە روانگـەی ئـەوەوە کـە ئـەو فەقیهـە بەڕێزانـە کـاری ئیجتیهادیان ئـەنجام داوە . جـا موجتـەهیدیش بـە پێکـان بـەرز دەبێتـەوە ، کـەچیی بـە نەپێکان نزم نابێتەوە ، چونکە ئەگەر پێکای دوو پاداشـتی هەیـە و گـەر نەشـی پێکـا ئـەوا یەک ئەجری هەر دەبێ و ، هەموو زانایەکیش دەگونجێ هەڵە بکا . جا ئەوە بوو شـافیعیی بە شێوەیەکی گشتیی ستایشی زانایانی عیراقی دەکرد و دەیفەرموو : « الناس عيال علـى أهل العراق في الفقه » .[٣١٣] بە تایبـەتییش رێـزی زیـاتری لـە ئەبوحەنیفـەی ئیمـامی عـیراق دەگرت کە دەیفەرموو: « من أراد أن يتبحـر في الفقه فهو عيال علــى أبي‌حنيفــة » .[٣١٤] هەروەها دەیفەرموو : بە مالیکئیان وت : ئایا ئەبوحەنیفـەت دیـوە ؟ فـەرمووی : بـەڵێ ، پیاوێکم دیوە کە ئەگەر بیویستایە بیسەلمێنێ کە ئـەم کۆڵەکەیـە ئاڵتوونـە ئـەوا بەڵگـەی دەست دەخست .[٣١٥]

بەڵام لەوە ناچێ شافیعیی و ئەبویووسفی قاضیی یەکیان بینیبـێ ، چونکـە ئەبویووسـف لە ساڵی ( ١٨٢ ) ی کۆچییدا کۆچی دوایی کـردووە و شـافیعییش لـە سـاڵی ( ١٨٤ ) دا

---

[٣١١] آداب الشافعي ( ٢٠٩ ) .
[٣١٢] آداب الشافعي ( ٢٠٩ ) .
[٣١٣] آداب الشافعي ( ٢١٠ ) .
[٣١٤] الجواهر المضية ( ٢ : ٤٥٦ ) .
[٣١٥] الجواهر المضية ( ٢ : ٥٠٨ ) .

بۆ یەکەم جار سەری لە بەغداد داوە ، مەگەر ئەبویووسف سەری لە مەککە و مەدینە دابێت و لە سەردەمی لاویی شافیعیی‌دا چاویان بە یەکتر کەوتبێ .

بەڵام ئەوە بوو کە هاتە بەغداد چاوی بە موحەممەدی کوڕی حەسەن کەوت و کتێبەکانی نووسی‌یەوە و رێزێکی چاکیشی لێ دەگرت ..

هەروەها ستایشی پیاوێکی خەڵکی رەی دەکرد کە خەڵکی لە دەوری قورئان جەم کردووە کە ناوی مووسا بووە و بە ئەبوعیمرانی صووفیی بە ناوبانگ بووە .

هەندێ کەڵە زانای تر هەبوون کە بە لایەوە زۆر سەنگین بوون ، بەڵام بە داخەوە بوو کە چاوی پێ نەکەوتبوون ، وەک : ( لیث ) ی کوڕی سەعدی کوڕی عەبدورڕەحمانی فەهمیی کە زانا و فەقیهـ و سەرۆکی میصر بووە و لە ساڵی ( ١٧٥ )ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە و ، وەک ئیبن ئەبوذیئب ، موحەممەدی کوڕی عەبدورڕەحمانی کوڕی موغیرەی کوڕی حاریثی قورەیشیی عامیریی ، کە ئیمامێکی خواناسی دامەزراو و ، پیاوێکی زانستدۆستی راستیی‌بێژ بووە و ، لە سەردەمی مالیک‌دا و لەوەو پێشیش فەقیهی مەدینە بووە و ، ئیمام ئەحمەدیش زۆر بە واریع ی داناوە [٣١٦] و، لە ساڵی ( ١٥٩ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

ئیمام شافیعیی لە راستیی‌بێژیی ئیبن ئەبوذیئب زۆر دڵ خۆش بوو کە لە بەردەم شمشێری خەلیفەکان‌دا راستیی وتووە و ، هیچ هێزێک نەی‌توانیوە چاوترسێنی بکات .

موحەممەدی کوڕی عەبدورڕەحمانی دەینەوەریی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : عەبدولحەکەم بۆمانی باس کرد و وتی : شافیعیی هەواڵی داینێ و ، فەرمووی : مامەم موحەممەدی کوڕی عەلیی ( کە ئامۆزای باپیری شافیعیی بووە ) بۆمی باس کرد و وتی : ئامادەی مەجلیسی ئەمیری ئیمان‌داران ئەبوجەعفەری مەنصوور بووم و ، ئیبن ئەبوذیئب و حەسەنی کوڕی زەیدی کوڕی ئیمام حەسەنی والیی مەدینەش لەوێ بوون . ئەوە بوو غیفاریی‌یەکان ( هۆزەکەی ئەبوذەڕڕی غیفاریی - خوا لێی رازیی بێ - ) هاتن و لە هەندێ هەڵس و کەوتی حەسەن شکاتیان بە لاوە کرد . ئەویش وتی : ئەی ئەمیری ئیمان‌داران ! لە بارەی ئەمانەوە پرسیار لە ئیبن ئەبوذیئب بکە . کە پرسیاری لێ کرد ، وەڵامی دایەوە : شاهێدیی دەدەم کە باسی شەرەف و ئابرووی موسڵمانان دەکەن و ، ئازاری زۆریشیان دەدەن . ئەبوجەعفەر وتی : بیستتان ؟ وتیان : لە بارەی حەسەنیشەوە پرسیاری لێ بکە .

---

[٣١٦] توالي التاسيس (٥١).

وتی : دەربارەی ئەو چیی ئەڵێیت ؟ وتی : شاهێدیی دەدەم کە حوکم بە ناڕەوا دەدات و ، شوێن هەوای خۆی دەکەوێت . موحەممەد ( کە ریوایەت دەکات ) ئەڵێت : جلەکانم پێچان بە خۆمەوە و ، شمشێربەدەستیش بەسەر سەری ئەبوجەعفەرەوە وەستا بوو ، چونکە دەترسام فەرمانی پێ بکا بیکوژێ و ، خوێنەکەی بەر جلەکانم بکەوێت . ئەبوجەعفەر وتی: حەسەن بیستت چیی وت ؟ ئەویش وتی : دەربارەی خۆیشت پرسیاری لێ بکە . ئەبوجەعفەر بە ئیبن ئەبوذیئبی وت : ئەی دەربارەی من چیی ئەڵێی ؟ وتی : ئایا ئەمیری ئیمانداران دەستبەردارم دەبێت ؟ وتی : بەخوا پێم ئەڵێیت ، دەمێ بە نەرمیی و دەمێ بە توندیی لەگەڵیا هات . وتی: شاهێدیی دەدەم کە سامانت بە ناڕەوا وەرگرتووە و ، داویشتە بە کەسانێک کە شیاوی نین . ئەبوجەعفەر لە شوێنەکەی خۆیەوە هات و دەستی لە پشت ملی ئیبن ئەبوذیئب گیر کرد . موحەممەد ئەڵێت : لە ترسی ئەوەی کە فەرمان بە کوشتنی بدات جلەکانم پێچان بە خۆمەوە ، نەوەکو خوێنەکەی بەر جلەکانم بکەوێت . پاشان خەلیفە وتی : بەخوا ! ئەگەر من نەبوومایە ئێستە رۆڵەکانی فارس و رۆم و تورک و دەیلەم ئەم شوێنەیان لێت سەندبوو . مامۆستا وتی : ئەبوبەکر و عومەریش کاریان گرتە دەست و ، شوێن حەقیش کەوتن و ، بە یەکسانییش سامانیان بەش کرد و ، پشت ملی فارس و رۆمیشیان گرت و لووتیشیان چەقاندن بە خۆڵدا . ئەبوجەعفەر پشت ملی بەردا و ، وازی لێهێنا و وتی : بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کە دەزانم راستگۆی دەمکوشتی . ئیبن ئەبوذیئبیش بە ئەبوجەعفەری وت : بەخوا من ئامۆژگاری چاک ترم بۆت لە مەهدیی واتە کورەکەی .[٣١٧]

حەرمەلەش لە شافیعیی‌یەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویە : موحەممەدی کوڕی عیجلان[٣١٨] فەرمانی بە چاکە دەدا و دوورەپەرێزیی لە خراپە دەکرد . رۆژێکیان والیی مەدینە درێژەی بە وتارەکەی دا . کە هاتە خوارەوە و نوێژی کرد ، ئیبن عیجلان هاواری لێ کرد و وتی : کابرا ! لە خوا بترسە . قسە و باسەکەت لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ درێژە پێ دەدەی ؟! والیی فەرمانی دا بیهێنن و بەند کرا . هەواڵ گەیشتە ئیبن ئەبو ذیئب ئەویش خۆی گەیاندە لای والیی و پێی وت : ئیبن عیجلانت بەند کردووە ؟ والیی وتی : گوایا بەوەوە ناوەستێ لە بەینی خۆم و خۆیدا فەرمانم بەسەردا دەکات ، تا بە

---

[٣١٧] آداب الشافعي (٤٦) .

[٣١٨] موحەممەدی کوڕی عیجلانی قورەیشیی یەکێکە لە زانا دڵسۆزە خزمەت گوزارەکانی ئیسلام کە ئیمام ئەحمەد و ئیبن موعین بە ( ثقة)یان داناوە . ساڵی ( ١٤٨ ) ی کۆچیی کۆچی دوایی کردووە .

فەرمانەکەی ئەو بکـەین ، کـەچیی لەبـەر چـاوی خـەڵکیی‌دا هاوارمـان لێ دەکـات و بـێ دەسەلاتمان دەردەخات ؟

ئیبن ئەبوذیئب وتی : ئیبن عیجـلان ئەحمەقـە ، ئەحمەقـە . ئـەو چـاوی لێتـە حـەرام دەخۆیت و ، جل و بەرگی حەرام دەپۆشیت ، کەچیی نارەزایی دەرنـابڕێ و ئـەڵێت : بەسـەر سینبەری پێغەمبەری خواوە ﷺ درێژە بە قسە و باسەکەت دەدەیـت !! والیـی وتـی : ئیبن عیجلان بکەنە دەرەوە ، هیچی لەسەر نیە .[٣١٩] وەکُ بڵێ : رەحمەت لە کفن دزی پێشوو !

هەروەها شاهێدیی راستگۆیی ئەصمەعیی داوە و ، شاهێدییشی داوە کە کەسسائیی لە ( نحو ) دا زۆر شارەزایە .[٣٢٠]

زانا و فەقیهەکانی ئیسلام ، کە هەموو گیانیان ویژدان و دڵ پاکی‌یە ، لە رۆڵـی گرنگـی ئیمـام شـافیعیی ئاگـادار بـوون و ، دەیـانزانیـی خـاوەنی چ ئیخلاصێکـی بێوێنەیـە بـۆ خزمـەتکردنی قورئـان و سـوننەت .. ئـەو زانـا بەرێزانـە دەیـانزانیـی چـەندە قـەرزاری شافیعیین ، بۆیە لە ماوەی ژیانی‌دا و دوای مردنیشی ، بە نهێنیی و بە ئاشکرا لـە خـوای گەورە بۆی دەپاڕانەوە کە بە چاکترین شێوە لە بریی ئەو خزمەتە مەزنە پاداشتی بداتەوە .

ئەوەتا ئیمام ئەحمەد دان بە فەزڵی شـافیعیی‌دا دەنـێ و ، دەری دەبـڕێ کـە ئـەوە سـیی ساڵە دوعای بۆ دەکات و ، داوای چاوپۆشیی بۆ دەکات کە ئەفەرموێ : « هذا الذي تـــرون كله أو عامته من الشافعي ، وما بت منذ ثلاثين سنة إلا وأنا أدعو الله للشافعي وأستغفر له» .[٣٢١]

هەروەها دەری بڕیوە کە شـەش کـەس هـەن لـە بەرەبـەیان‌دا دوعایـان بـۆ دەکـات کـە یەکێکیان شافیعی‌یە .[٣٢٢]

هەروەها فەرموویە : کەسێ پێ نازانم لە سـەردەمی شـافیعیی‌دا لـە شـافیعیی منـەتی زیاتری بەسەر ئیسلامەوە هەبێت .. منیش لە دوای نوێژەکـانم بـۆی دەپاڕێمـەوە و ئـەڵێم : خوایە لە خۆم و ، لە دایکُ و باوکم و ، لە موحەممەدی کـوڕی ئیدریسـی شـافیعیی خـۆش ببیت .[٣٢٣]

---

[٣١٩] آداب الشافعي ( ٤٨ ) .

[٣٢٠] نزهة الألباء ( ٧١ ) .

[٣٢١] توالي التأسيس ( ٥٧ ) و وفيات الأعيان ( ١: ٥٦٥ ) .

[٣٢٢] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٢ ) .

[٣٢٣] معجم الأدباء ( ١٧ : ٢٠٣ ) .

یـەحیای کـوڕی سـەعیدی قـەططانیش کـە لـە سـەردەمی خۆیدا پێشـەوای زانایـانی فەرمووده بووه وتوویە : ئەمە چوار ساڵە لە نوێژدا بۆ شافیعیی لە خوا دەپاڕێمەوە .[٣٢٤]

هەروەها عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدییش ، کە لەسەر داوای ئەو شافیعیی ( الرسالة ) ی نووسیی ، ئەڵێت : هەرچیی نوێژ بکەم تیایا لە خوا دەپاڕێمەوە بۆ شافیعیی .[٣٢٥]

## ( ١١ ) نوێ خوازی صەدەی دووهەم :

پێغەمبەری خـوا ﷺ دەری بڕیـوە کـە خـوای گـەورە لەسـەری هـەموو صـەد سـاڵێکدا نوێکردنەوەی ئیسلام بە کەسێک دەسپێرێ ، وەک لەم فـەرموودەدا دەی بینـین . لـە ئـەبو هـورەیـرەوە ـ خوا لێی ڕازیی بێ ـ لـە پێغـەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویـە : « یبعث الله لهذه الأمة علی رأس کل مائة سنة من یجـدد لهـا دینـها » . بـەدوای ئـەم فەرموودەیەدا ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ : سەرنجی ساڵی صەدەمینم دا دەبینـم پیاوێکـە لە ئال و بەیتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، عومەری کـوڕی عەبدولعـەزیز و ، سـەرنجی سـەری صەد ساڵی دووهەممدا دەبینم پیاوێکە لە ئال و بەیتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، موحەممـەدی کـوڕی ئیدریـس . ئیـبن سـوبوکیی دەری دەبڕێـت کـە ئەمـە شـتێکی سـەلماوە لـە ئیمـام ئەحمەدەوە .[٣٢٦]

شێخ ئەبولوەلید حەسسانی کوڕی موحەممەدی فەقیھ وتوویە : لـە سـاڵی سـێ صـەد و سێدا لە مـەجلیسـی قـاضیی ئەبولعەبباسـی کـوڕی سورەیج دا بوویـن ، مامۆستایەک لـە ئەهلی عیلم هەستایە سەرپێ و پێی وت : ئەی قاضیی ! مژدە بێت . خوای گەورە لەسەری هەموو صەد ساڵێکدا کەسێک بۆ ئەم ئوممەتە ڕەوانە دەکات تـا کاروبـاری دینەکـەی بـۆ نوێ بکاتـەوە . ئـەوە بـوو خـوای گـەورە لەسـەری صـەد سـاڵی یەکـەمدا عومـەری کـوڕی عەبدولعەزیزی ڕەوانە کرد و ، لە ساڵی صەدوسێدا کۆچـی دوایـی کـرد و ، لەسـەری صـەد ساڵی دووهەمیشدا ئەبوعەبدوڵڵا موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعیی ڕەوانـە کـرد و ، لە ساڵی دووصەد و چواردا کۆچی دوایی کرد و ، لەسەری صەد ساڵی سێهەمیشدا تـۆی ڕەوانە کرد . پاشان ئەم شیعرەی وت :

[٣٢٤] تهذیب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٩ ) .

[٣٢٥] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١٣ ) .

[٣٢٦] طبقات الشافعیة ( ١ : ٢٠٠ ) .

إثنان قد مضيا فبورك فيهما عمر الخليفة ثم حلف السؤدد
الشـــافعي الألـــمعي محمد إرث النبوة وابن عـــم محمد
أبشر ابا العباس إنك ثالث من بعدهم ســـقياً لتربة أحمد

ئەڵێت : قـاضیی هـاواری کـرد و دەسـتی کـردە گریـان و وتـی : ئـەم پیـاوە مردنمـی ڕاگەیاند . ئەڵێت : قاضیی ئەبولعەبباس هەر لەو ساڵەدا مرد . خەطیبیش لە ( مێژوو )ەکەیدا باسی کردووە کە ئیبن سورەیج لە ساڵی سێ صەد و شەشدا کۆچی دوایی کردووە .[٣٢٧]

ئیبن سوبوکییش لە ( الطبقات ) دا ئەڵێت :

لە سەری صەد ساڵی چوارەمینیـشدا وتوویانـە کـە : شـێخی ئیسـفراییینیی تیـا ڕەوانـە کراوە و ، وتووشیانە کە : مامۆستا سەهلی کوڕی ئـەبو سـەهلی صـەعلوکیی تیـا ڕەوانـە کراوە ، کە هەردووکیان دوو ئیمامی مەزنی دامەزراوی مەزهەبی شافیعیین .

هەروەها وتوویە : پێنجەمینیش غەزالییە و ، شەشەمینیش ئیمام فەخرەددینی ڕازییە و ، حەوتـەمینیش شـێخ تـەقیوددینی کـوڕی ( دقیـق العیـد )ەو ، هـەر هەمووشـیان لـە ئیمامانی مەزهەبی شافیعیین .

## ( ١٢ ) عەقڵی شافیعیی :

گرنگ نیە خەڵکیی شاهێدیی لەسەر ژیریی کەسێک بدەن ، چونکە عـەقڵ و ژیریـی ئـەو کەسە بە پێی خزمەتکردن و کەڵک گەیاندنیەتی بە خەڵکیی و ، بە پێی ئەوەیـە کـە تـا چ ڕادەیـەک مێشـکی بـۆ بـیر و هەسـتی نـوێ دەڕوات و ، هەسـت بـە لادان و سـەرگەردانیی دەوروبەری دەکات . بە تایبەت ئەگـەر کەسـێک لـە سـەردەمێکدا بژیـی کـە کۆمەڵەکـەی ڕادەی ژیریـی و تێگەیشـتنیان بـەرز بێـت و ، ئـەویش پێـش هـەموویان بداتـەوە و ، بێسەلمێنێ کە ئەو خاوەنی بەڵگەی زانستیانەی زۆر بـەهێزە و ، لـە هـەمان کـاتیشدا بـە لای کاربەدەستی ڕۆژگارەوە هیچ پشتگیرییەکی نیە و ، خاوەنی پارە و پوولێکیش نیـە . ئا لەم حاڵەتەدا ئەو کەسە لە هەمووان ژیرترە ..

[٣٢٧] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣١٤ ) .

جا ئیمام شافیعیی لە سەردەمی خۆیدا وەها بوو ، چووبــووە ســەر لووتکــەی قووچــەکی ژیریی ئوممەتی ئیسلامەوە ، کە مەگەر چەند دانەیەکی یــەکجار کـەم بتوانـن لێـی نزیـک بکەونەوە .

خەڵکێکی زۆر لە زانایان و تێگەیشتووان شاهێدییان لەسەر ژیریی کەموێنەی شـافیعیی دەدا ، بێئەوەی تەماعێکیان پێی ببێ ، یان لێی بترسـن ، یـان خـزم و کەسـی بـن .. هـەتا هەندێکیش لەوانەی کە لە رێبازیی سوننەت و جەماعەت لایان دابــوو دانیـان بـەوەدا دەنا کە شافیعیی خاوەنی عەقڵ و ژیرییەکی بێوێنەیە . ئەوەتا ـ بـۆ نموونـە ـ بیشـری کـوڕی غەییاثی مورِیسیی ، کە فەقیـهێکیی موعتەزیلییـە و قوتـابیی بەردەسـتی ئـەبو یووسـف بووە ئەڵێت : « مع الشافعي نصف عقل أهل الدنيا »[٣٢٨] هەورەها ئەڵێت : « ما رأيـــت أعقل من الشافعي » .[٣٢٩]

یەحیای کوڕی ئەکثەمیش ، کە سەرۆکی قاضییانی بەغداد بووە و ، خـاوەنی پلەیـەکی وەها بەرز بووە بە لای خەلیفە مەئموونەوە کە بە شەو و بە رۆژ بتوانێ بچێتە لای خەلیفـە، ئەڵێت : « ما رأيت أحداً أعقل من الشافعي » .[٣٣٠]

هەروەها کەڵەزانا و فەقیهـ و پیاوی ژیری میصر ، یوونسی کوڕی عەبدولئەعلا وتوویــە: نەمدیوە کەسێک لە شـافیعیی عـاقڵتـر بێـت ، جا ئەگـەر ئوممـەتی موحەممـەد ﷺ کـۆ بکرێنەوە و لە عـەقڵی شافیعیی بەشیان بدرێ ، بەشیان دەکات .[٣٣١]

رەبیعی کوڕی سولەیمانی قوتابییشی ئەڵێت : ئەگەر عـەقڵی شافیعیی بە نیوەی عـەقڵی ئەهلی دنیادا کێشانە بکرێت ئەوا ئـەو قـورستـرە و ، ئەگـەر لـە بـەنی ئیسـرائیلیی بوایـە پێویستییان پێی دەبوو .[٣٣٢] واتە هەرچەندە بەنی ئیسرائیلیی پێغەمبەری زۆریان بۆ رەوانــە کراوە ، هێشتا پێویستییان بە یەکێ وەک شافیعیی هەیە.

هەتا کاتێکیش کە منداڵ بووە و لای مامۆستایانی مەککە دەرســی دەخوێنـد عـەقڵ و ژیریی و زیرەکیی بێوێنەی پێوە دەبینرا .

---

[٣٢٨] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٣ ) .
[٣٢٩] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٣ ) .
[٣٣٠] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦١ ) .
[٣٣١] توالي التأسيس ( ٥٨ ) .
[٣٣٢] توالي التأسيس ( ٥٨ ) .

حومەیدیی دەری بڕیوە کـە سـوفیانی کـوڕی عویەینـە و ، موسـلیمی کـوڕی خـالید و ، سـەعیدی کوڕی سـالم و ، عەبدولمـەجیدی کـوڕی عـەبدولعـەزیز و ، مامۆسـتایانی تـری مەککە ، دانیان بە زیرەکیی و عـەقڵیی شافیعییدا ناوە .[٣٣٣]

## ( ١٣ ) تەقواو خواپەرستیی شافیعیی :

شافیعیی بە هۆی خواپەرستیی و ئیخـلاص و تەقوایـەوە خـوای گـەورە پایـەی پـیّدا و کردیـە پێشـەوای موسـڵمانان تـا زانسـتی راسـتەقینەی قورئـان و فـەرموودەیان پێشـکەش بکـات، چونکـە بـە راسـتیی زانسـت کـاتێک بـە کـەڵک دێـت و کاریگـەر دەبێـت ، کـە خـاوەنـەکـەی خۆی پێش هـەموو کەسێکی تـر رەفتـاری پـێ بکـات و ، خـۆی نـموونـەی ئیمـانداری رەفتار جوان بێت ..

تەقواش : بریتیيـە لـەوەی کـە ئیمـاندار واز لـەو شـتانە بـهێنێ کـە خـۆی حـەزیان لێ دەکات و شوێن ئەو کارانە بکەوێ کە شەرع پێی باشە و لە موسڵمانیان داوا دەکات ..

وەرەعیش : بریتیيە لەوەی موسڵمان واز لەو شـتانە بێنـێ کـە گومانیـان لێ دەکرێ ، نەوەکو تووشی حەرام ببێ ، بگرە دەست لە شتی موباحیش هەڵ دەگرێ نەوەکو ببێتە هـۆی تووشبوونی شتی گومان لێ کراو و، ئەو گومان لێکراوەش ببێتە هۆی تووشبوونی حەرام.

سـوپاس بـۆ خـوا ئیمـام شـافیعیی هـەروەک لـە ئیجتیـهاد و فیقهـ دا پێشـەوا بـوو ، هەروەها لە ئیمان و تەقوا و وەرەع و خواپەرستییشدا پێشەوا بوو ..

رەبیـع ئـەڵێت : عـەبدوڵلای کـوڕی عـەبدولحەکـەم ـ کـە لـە مامۆسـتا پایـەدارەکانی مەزهەبی مالیکیی میصر بووە ـ بە شافیعیی ئەڵێت : ئەگەر دەتـەوێ لـەم وڵاتـەدا ـ واتـە میصر ـ نیشتەجێ ببێ ، با خۆراکی ساڵێکت هـەبێ و ، هـات و چۆی مـەجلیسـی سوڵتان بکە تا پێی دەسەڵاتدار ببی . شافیعیی فەرمووی : ئەبومحەممەد ! هەرکەسێ بـە تـەقوا دەسـەڵاتدار نـەبێ ، هـەرگیز دەسـەڵاتی نـابێ . مـن لـە غـەززە لـە دایـک بـووم و ، لـە حیجازیش گەورە کراوم و ، خۆراکی شەوێکمان نەبووە و ، هەرگیز بە برسێتییش سـەرمان نەناوەتەوە .[٣٣٤]

---

[٣٣٣] توالي التأسيس ( ٥٤ ) .

[٣٣٤] توالي التأسيس ( ٦٧ ) .

شافیعیی وەکێ خواناسێکی رەببانیی زۆر بە چاکیی خواپەرستیی بەجێدەهێنا ، ئەوەندە هەبوو زەکاتی نەداوە ، چونکە سەرەتا هەژار و دەست کورت بوو و ، پاشـانیش کـە پـارە و سامان رووی تێکرد ئەوەندە سەخیی بوو هیچی لە دەستدا نەدەمایەوە .

لە بارەی شەونوێژیشەوە رەبیع دەری دەبڕێ کە شافیعیی هەتا کۆتایی تەمەنی هـەموو شەوێک شەونوێژی دەکرد .[٣٣٥]

حوسەینی کوڕی عەلیی کەرابیسیی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە هەشتا شەو لە خزمـەتی شافیعییدا بووە و نزیکەی سێیەکی شەو شەونوێژی دەکـرد ، کـە لـە پـەنجا ئایـەت زیـاتر قورئانی لە یەک رەکعەتدا نەدەخوێند و ، هـەرچیی تووشـی ئایـەتی رەحمـەت ببوایـە بـۆ خۆی و ئیمانداران لە خوای گەورە دەپاڕایەوە و ، هـەرچیی تووشـی ئایـەتی سزا و عـەزاب ببوایە پەنای بەخوا دەگرت و داوای سەرفرازیی بۆ خۆی و ئیمانداران دەکرد .[٣٣٦]

لە رەبیع ەوە ئەگێڕنەوە وتوویە : شافیعیی شەوی کردبـوو بـە سـێ بەشـەوە : سـێیەکی یەکـەم ئەینووسیی و ، سـێیەکی دووهـەمی نوێـژی دەکـرد و ، سـێیەکی سـێهەمیش دەخەوت .[٣٣٧]

هەرچیی بە شەویشدا قورئانی بخوێندایە دەبوا لە نوێژدا بوایە ، وەکێ موزەنیـی دەری دەبڕێ .[٣٣٨]

لەبەر ئەوەش کە بە منداڵیی هـەموو قورئـانی لەبـەر کردبـوو لـە قورئـان خوێنـدن تـێر نـەدەبوو ، چونکـە لـەزەتێکی چـاکی لـە بەلاغـەت و ئیعجـازی قورئـان وەردەگـرت . بۆیـە گەورەترین خۆشیی دڵی ئەوە بوو خەریکی قورئان خوێندن بوایە ، بە رادەیەکێ کـە هـەموو مـانگێکێ سیی جار قورئانی خەتم دەکرد و ، لە رەمەزانیشدا شەصت جار خەتمی دەکـرد ، جگە لەو قورئانەی کە لە نوێژدا دەیخوێند ، وەکێ رەبیع گێڕاویەتەوە .[٣٣٩]

---

٣٣٥ توالي التأسيس ( ٦٨ ) .

٣٣٦ شذرات الذهب .

٣٣٧ صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٤ ) .

٣٣٨ توالي التأسيس ( ٧٩ ) .

٣٣٩ توالي التأسيس ( ٦٠ ) وصفة الصفوة ( ٢ : ١٤٥ ) .

لەو کارە سـوننەتانەش کـە شـافیعیی ئـەنجامی دەدان زۆر صەڵـەوات دان بـوو لەسـەر پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانیشی بۆ ئەوە هان دەدا و دەیفەرموو : « پێم خۆشـە صەڵـەواتی زۆر لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن » .[٣٤٠]

هەتا وای دەبینی کە پێویستە لەگەڵ پاڕانەوەدا لە خوا صەڵـەوات لەسـەر پێغەمبـەری خوا ﷺ بدرێت . هەروەها لە هەموو کەس زیاتر بە چاوی ڕێزەوە سەیری پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد ، هەتا پێی ناخۆش بوو کەسێک بیوتایە : ( قال الرسـول ) ، بـەڵکو پێویسـتە بڵێ : ( قال رسول الله ﷺ ) ئەمەش لەبەر ڕێز لێنانی .[٣٤١]

## ( ١٤ ) سەخاوەتی شافیعیی :

یەکێ لە سیفەتە جوانەکانی عەرەب بریتی‌یە لە سەخاوەت و نانّدان و بەخشـیین ، بـە رادەیەک کە جێی شانازی‌یان بێت ، جا لە ناو تیرەکاندا چەندین پیاوی زۆر سـەخیی هـەڵ کەوتبوون کە سەخاوەتیان بە نموونە دەهێنرایەوە ، یەکێ لەوانە حاتەمی طەی و ، کـەعبی کوڕی مامە و ، ئەوسی کوڕی حاریثە و ، هەرەمی کوڕی سینان .

کاتێک کە ئیسلام هات و خەڵکەکە پۆل پۆل موسڵمان بوون ، ئەوەیان کە لە سـەردەمی نەفامیی‌دا چاک بوو ، بەو چاکەیەوە هاتە ریزی موسڵمانانەوە .. پیاوی ئازا هەر ئازا بـوو ، سەخیی هەر سەخیی بوو .. بەڵام نییەتی ئەو کەسە دەگۆڕا .. جاران کـە چاکەیـەکی دەکرد مـەبەستی نەفسی خۆی بوو و حەزی لە ناوبانگ و ڕێزلێنان بوو ، بەڵام دوای موسڵمانبـوون مـەبەستی ڕەزامەندیی خوا بوو .. ئەوە بوو لە ناو هاوەڵاندا سنگفراوان و دڵگوشـادی زۆر هەڵ کـەوتن کـە ئەوپـەڕی سـەخاوەتیان بـۆ ڕەزامـەندیی خـوا دەنوانـد ، وەک ئەبوبـەکر و عومـەر و عوثمان و عـەلیی و عەبدوڕڕەحمان و هی تریش .

ئیمامی شافیعییش وەک عەرەبێکی قوڕەیشیی موطـــەللیبیی ئیمـاندار سـەخاوەتی بێوێنە بوو . جا هەرچەندە زۆربـەی ژیـانی دەسـتکورت بـوو ، بـە رادەیـەک کـە خۆراکـی شەوێک شک نەبات ، هەر کاتێک پارەیەکی پێ بگەیشتایە ئـەوا بـە راسـت و چـەپدا بـە هەژارانی دەبەخشیی .

---

[٣٤٠] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٦ ) .

[٣٤١] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٦ ) .

رەبیع ئەڵێت : ناوی خاوەن سەخاوەتمان بیستووە و هەندێکیش لە دەوروبەری خۆمـاندا هەبوون ، بەڵام وەک شافیعییمان نەدیوە .[٣٤٢]

عەمری کوڕی سوادی سەرجییش وتوویە : لە دینار و دیرهەم و خواردندا شافیعیی لـە هەموو کەس سەخییتر بوو .[٣٤٣]

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولحەکەم یش وتوویە : شافیعیی لـەوەدا کـە بوویێتی لە هەموو کەس سەخییتر بووە .[٣٤٤]

دیسان رەبیع ئەڵێت : ئەگەر کەسێک داوای شـتێکی لـە شـافیعیی بکردایـە ، ئـەوا لـە شەرمی داواکارەکەدا دەم و چاوی سوور دەبوویەوە و ، بـە پەلـە ئـەو شـتەی دەدایـێ . خـۆ ئەگەر لەلای نەبوایە کاتێ دەگەڕایەوە ئەو شتەی بۆ دەنارد .[٣٤٥]

ئەمـەش هـەندێ نموونـەی سـەخاوەتی . حومـەیدیی ئـەڵێت : جارێکیـان شـافیعیی لـە یەمەنـەوە هاتـەوە و ، بیسـت هـەزار دیرهەمیشـی پـێ بـوو . هـەر لـە دەرەوەی مەککـە چادرەکەی هەڵ داو ، لە جێی خۆی هەڵ نەستا هەتا هەمووی بەخشییەوە .[٣٤٦]

هەروەها ئەڵێت : جارێکیان شافیعیی بە سێ هەزار دینـارەوە هاتـەوە . ئامۆزاکـانی و خەڵکی تریش هاتن بۆ لای و ، ئەویش دەستی بە بەخشینی پارەکە کرد . کە هەستا هیچی لە لا نەمابوو .[٣٤٧]

زوبەیری کوڕی سولەیمانی قوڕەیشیی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت :

شافیعیی فەرمووی : هەرئەمە هاتە لام و سەلامی ئـەمیری ئیمـاندارانـی بـۆ هێنـام و وتی : فەرمانی داوە پێنج هەزار دینارت بدرێتێ . کە هێنایان بـۆی ( ٥٠ ) دینـاری لێ دا بە خوێنگرەکەی .. پاشان چەند پارچە قوماشێکی هێنا و کردنیە چەند توورەکەیەک بۆ ئـەو پارەیە و دابەشی کردن بەسەر ئەو قوڕەیشییانەدا کـە لـەوێ ئامـادەبوون و هـەر کەسـێکی ئەهلی مەککەشی دەناسی توورەکەیەکی بۆ نارد ، هەتا کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە کەمتر لـە صەد دیناری پێ مابوو .[٣٤٨]

---

[٣٤٢] توالي التأسيس ( ٦٧ ) .
[٣٤٣] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٧ ) .
[٣٤٤] توالي التأسيس ( ٦٨ ) والوافي بالوفيات ( ٢ : ١٧٤ ) .
[٣٤٥] تهذيب الأسماء ( ١ : ٥٨ ) .
[٣٤٦] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٥ ) .
[٣٤٧] توالي التأسيس ( ٦٨ ) . دیناری ئەوسا بریتیی بوو لە یەک مسقاڵ زێر .
[٣٤٨] توالي التأسيس ( ٦٨ ) .

له ئەبوئەوریشەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویە : شافیعیی ویستی بچێت بۆ مەککە و هەندێ پارەشی پێ بوو ، پێم وت : خۆزگە پارچە موڵکێکت بۆ منداڵەکانت بکڕیایە ، چونکە لەبەر نەرم و نیانیی پارەی لە دەستدا نەدەمایەوە . ڕۆیشت و پاشان کە گەڕایەوە پرسیارم لێ کرد ، فەرمووی : لە مەککەدا پارچە موڵکێکم نەدیی بتوانم بیکڕم ، بەڵام لە مینادا چادرێکی گەورەم بۆ هاوەڵانمان هەڵ داوە ، تا کە حەجیان کرد بچنە ناوی .

ئەبوئەور ئەڵێت : کە دیتی وا من بایەخ بەوە دەدەم ، ئەم شیعرانەی فەرموون :

إذا اصبحتُ عندي قوتَ يومي فخلِّ الهمَّ عني يــا سعيدُ
ولا تــخطر هموم غدٍ ببــالي فإن غداً له رزق جــديد
أُســلِّم إن أراد الله أمــــراً وأتــرك ما أريد لما يريد [349]

دەری دەبڕێ کە ئەگەر خۆراکی ئەمڕۆی هەبێ پێویست بە خەفەت ناکات ، چونکە سبەینێ ڕزقی نوێی بۆ دێت و ، واش چاکە کاروبار بدرێتە دەست خوا ..

ڕەبیع یش ئەڵێت : ڕۆژێکیان لەگەڵ شافیعییدا بووین قایشی نەعلەکەی پچڕا و پیاوێک بۆی چاک کردەوە . فەرمووی : ئەی ڕەبیع ! ئایا لە پارەی خەرجییمان هیچت بەلاوە هەیە ؟

وتم : بەڵێ . فەرمووی : چەند ؟ وتم : حەوت دینار . فەرمووی : بیدەرێ . [350]

هەروەها ڕەبیع ئەڵێت : شافیعیی سواری گوێدرێژێک بوو بوو و ، بە بازاڕی ئاسنگەرەکاندا تێپەڕی کرد و قامچییەکەی لە دەستی کەوتە خوارەوە . خێرا پیاوێک هەڵمەتی دا و بە دەستی سڕیی و دایەوە دەستی . ئەویش بە خزمەتگوزارەکەی وت : چەند پارەت لایە بیدەرێ .. ئیتر نازانم ئایا حەوت دینار بوو یان نۆ ؟ [351]

له ربیع ەوە ئەگێڕنەوە وتوویە : شافیعیی دەعوەتێکی کرد ..

کاتێ کە خەڵکیی نانیان خوارد ، بوەیطیی پێمی وت : تۆش دانیشە ، نان بخۆ . وتم : کێ ماوەی داوین نان بخۆین ؟ ئەڵێ : شافیعیی بە گوێوە بوو و فەرمووی : پاک و بێگەردیی بۆ خوا ! هەموو سامانم بۆ تۆ حەڵاڵە .

---

[349] توالي التأسيس ( ٦٨ ) .
[350] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٨ ) .
[351] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٥٨ ) .

شافیعیی دەبوا هەموو رۆژێکٔ خێر و صەدەقە بکات . بە شەویش صەدەقـەی دەکـرد ، بە تایبەت لە رەمەزاندا و ، هەواڵی هەژاران و دەسـتکورت و لاوازانـی دەپرسـیی و ، زۆر بە سەخاوەت مەسرەفی بۆ ماڵ و منداڵی دەکرد و ، لە مەجلیسیشیدا زۆر بەرێز بوو .[٣٥٢]

## ( ١٥ ) حیکمەتی شافیعیی :

لەبەر ئەوەی کە شافیعیی پیاوێکی خاوەن عـەقڵ و ژیریـی بـوو و ، لەوپـەڕی پلـەشدا زیرەکٔ بوو و ، هەموو جۆرە ژیانێکی بە خۆیەوە دیی بوو .. ماوەیەکٔ هەتیوو و بیٚکـەس و هەژار .. پاشان ناودار و دەستدار و خاوەنی ناو و ناوبانگیی .. گەلیٚ لە وڵاتـانی ئیسـلامی دیی بوو .. تێکەڵیی خەڵکی جۆرا و جۆری کردبوو ، بوو بووە خاوەنی تاقیکاریيەکی وردی ژیان .. لەبەر ئەوە وتەی بە کەڵکٔ و پڕ حیکمەتی زۆری پێشکەش بـە موسـڵمانان کـرد و ، پێیشی خۆش بوو بە ئامۆژگاریی شیرین بیانخاتە سەر رێی سەرفرازیی هەردوو ژیان ..

رەبیعی کوڕی سولەیمان ئەڵێت : شافیعیی پێمی فەرموو :

« ئەی رەبیع ! رازییکردنی خەڵکٔ کارێکە نایگەیتیٚ . لەبـەر ئـەوە ئـەوەی بـۆت چاکـە ئەنجامی بدە ، چونکە رازیی ناکرێن ، ئـەوەش بزانـە هەرکـەس فـێری قورئـان بـوو لەبـەر چاوی خەڵکٔدا مەزن دەبێت و ، هەرکەسیش فێری فەرموودە بوو بەڵگەی بەهێز دەبێت و ، هەرکەسیش فێری ( نحو ) بوو سامی دەبێت و ، هەرکەسیش فێری عەرەبیی بوو سروشتی ناسکٔ دەبێت و ، هەرکەسیش فێری ژمارە بـوو رای بـەهێز دەبێـت و ، هەرکەسـیش فـێری فیقهـ بوو رێزی زیاد دەبێت و ، هەرکەسیش خۆی نەپارێزیٚ زانسـتەکەی بـە کـەڵکی نایـەت و ، ئەمـەش هەر هەمووی بەستراوە بە تەقواوە » .[٣٥٣]

حەرمەلـەی کـوڕی یـەحیاش ئـەڵیٚ : لــە شـافیعییم بیسـت کـە ئەیفـەرموو : دوای بەجیٚهێنانی فەرزەکان کارێکی تر نیە بۆ نزیکٔ بوونەوە لە خوا لە بەدەست هێنانی زانسـت چاکتر بێت .[٣٥٤]

هەروەها فەرموویە : بەدەست هێنانی زانست لە نوێژی سوننەت چاکترە .[٣٥٥]

---

[٣٥٢] توالي التاسيس ( ٦٨ ) .
[٣٥٣] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٤ ).
[٣٥٤] الطبقات الكبرى ( ٢ : ١٢٩ ) .
[٣٥٥] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٢ ) .

هەروەها فەرموویە : هەرکەس لە هەر مەسئەلەیەکدا خەڵک پێی پێکەنیی هەرگیز لە بیری ناچێتەوە .[٣٥٦]

هەروەها فەرموویە : هەرکەسێ بە بێ قەڵەم و کاغەز ئامادەی مەجلیسی زانست ببێ ، وەک ئەوکەسە وەهایە کە بە بێ گەنم چووبێت بۆ ئاش .[٣٥٧]

هەروەها فەرموویە : بەر لەوەی قسە بکەن ماوەیەک بێ دەنگ بن و ، بۆ دەرهێنانی حوکمیش ماوەیەک بیر بکەنەوە .[٣٥٨]

هەروەها فەرموویە : نموونەی ئەو کەسەی کە زانست بەبێ بەڵگە دەست دەخات ، وەک ئەو کەسە وەهایە کە بە شەو دار کۆ بکاتەوە و کۆڵەدارێک بە کۆڵەوە بگرێ و بە خۆی نەزانێ مارێکی تێدا بێ و بیگەزێ .[٣٥٩]

هەروەها فەرموویە : پلەبەرزیی زانایان تەقوا و ، خشڵی خۆڕازاندنەوەشیان رەوشت جوانیی و ، جوانییشیان سەخاوەتە .[٣٦٠]

هەروەها فەرموویە : هەرکەس زانستی خۆش نەوێ خێری تێدا نیە و ، تۆش نە ناسراویی و نە دۆستایەتییت لەگەڵیا نەبێ .[٣٦١]

رۆژێکیان شافیعیی برایە ژوورێک لە ژوورەکانی کۆشکی هاروونوڕڕەشید ، تا ماوەی چوونە ژوورەوەی بدرێت و ( سەرراج ) ی خزمەتگوزاریشی لەگەڵدا بوو و ، لەلای ئەبوصەمەدی ئامۆژگاریکەری منداڵەکانی رەشید دایینیشاند . سەرراج بە شافیعیی وت : ئەبوعەبدوڵلا ! ئەمانە منداڵی هاروونوڕڕەشیدن و ، ئەمەش ئامۆژگاریکەریانە و خۆزگە دەربارەی ئەو منداڵانە ئامۆژگارییت بکردایە . ئەویش رووی تێ کرد و فەرمووی : بەر لەوەی بتەوێ منداڵەکانی ئەمیری ئیمانداران چاک بکەیت خۆت چاک بکە ، چونکە چاویان لێتە .. ئەوەیان بەلاوە چاکە کە تۆ بە چاکی بزانی و ، ئەوەشیان بە لاوە ناشیرینە کە تۆ رقت لێی بێ .. فێری قورئانی پیرۆزیان بکە ، بەڵام زۆریان لێ مەکە و لێی وەرس ببن و ، پشتگوێشیان مەخە و پشتی لێ هەڵ بکەن .. پاشان پاکترین شیعر و ،

---

[٣٥٦] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٢ ) .
[٣٥٧] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .
[٣٥٨] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٢ ) .
[٣٥٩] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .
[٣٦٠] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .
[٣٦١] توالي التاسيس ( ٧٢ ) .

بەڕێزترین فەرموودەیان بۆ بگێڕەوە و ، تا زانستێکیش بە چاکیی ڕەوان نەکەن ، مەیان بەرە سەر زانستێکی تر ، چونکە بیستنی شتی زۆر تێگەیشتن تێک دەدات .[٣٦٢]

هەروەها فەرموویە : پیاو لە دنیادا بە چوار شت کامڵ دەبێت : بە دینداریی و ، دەستپاکیی و ، خۆپارێزیی و ، سەنگینیی .[٣٦٣]

هەروەها فەرموویە : خێر و چاکەی دنیا و قیامەت وا لە پێنج سیفەتدا : سنگ تێریی و ، ئازارنەدان و ، کاسپیی حەڵاڵ و ، پۆشاکی تەقوا و ، متمانە بە خوا لە هەموو حاڵەتێکدا .[٣٦٤]

هەروەها فەرموویە : تۆ ناتوانی هەر هەموو خەڵکیی ڕازیی بکەی . کەواتە نێوان خۆت و نێوان خوا چاک بکە و ، پاشان باکت لە خەڵکیی نەبێت .[٣٦٥]

هەروەها فەرموویە : دەست هەڵگرتن لە خواپەرستیی گوناهێکی تازە داهێنراوە .[٣٦٦]

هەروەها فەرموویە : چاکترین کردەوە سیانن : سەخاوەت لە دەستکورتییدا و ، وەرەع لە تەنیاییدا و ، وتنی وشەی ( حەق ) لەبەردەم کەسێکدا کە خاوەنی دەسەڵات بێ .[٣٦٧]

دەربارەی هەڵس و کەوت لەگەڵ دۆست و برادەردا ئامۆژگاریی یونسی کوڕی عەبدولئەعلا دەکات و ئەڵێت : ئەی یونس ! ئەگەر لە دۆستێکەوە شتێکت بیست و پێت ناخۆش بوو ، نەکەی دوژمنایەتیی لەگەڵدا بکەیت و پەیوەندیی لەگەڵدا بپچڕێنی ، ئەو کاتە وەک ئەوکەسەت لێ دێ کە بۆ گومانێک دەست لە یەقینی خۆی هەڵ دەگرێت ، بەڵکو کە پێی گەیشتی پێی بڵێ : دەربارەی تۆ ئەوە و ئەوەم پێ گەیشتووە و ، نەش کەی ناوی قسەهێنەرەکەی بە لاوە بڵێیت . ئەگەر دانی بەو کارەیدا نەنا پێی بڵێ : تۆ لە هەموو کەس ڕاستگۆتر و چاکتری . ئیتر لەوە زیاتر هیچ نەڵێیت . ئەگەر دانیشی پێدا نا و عوزرێکی گونجاوی هێنایەوە ، لێی وەربگرە ، ئەگەر وایشت نەزانی پێی بڵێ : مەبەستت چیی بوو بەوەی کە پێم گەیشتووە ؟ جا ئەگەر شتێکی باس کرد کە بە عوزر دابنرێ ئەوا لێی وەربگرە . بەڵام ئەگەر عوزری بە دەستەوە نەبوو و ، تۆش پێی نارەحەت

---

[٣٦٢] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٥ ) .

[٣٦٣] توالي التأسيس ( ٧٢ : ٧٣ ) .

[٣٦٤] توالي التأسيس ( ٧٢ ـــ ٧٣ ) .

[٣٦٥] توالي التأسيس ( ٧٢ ـــ ٧٣ ) .

[٣٦٦] توالي التأسيس ( ٧٢ ـــ ٧٣ ) .

[٣٦٧] توالي التأسيس ( ٧٢ ـــ ٧٣ ) .

بووی ، ئەوا ئەوکاتە تاوانێکی لەسەر تۆمار بکە . پاشان بە دەستی خۆتە : ئەگــەر بتـەوێ بە وێنەی خۆی بەبێ زیاد تۆڵەی لێ دەکەیتەوە و ، گەر بشتەوێ چاوپۆشیی لێ دەکـەی و، چاوپۆشییش لـە تـەقواوە نزیکـترە و ، زیـاتریش مایـەی سـەخاوەتە ، ئەمـەش بـە پێـی فەرمایشتی خوای گەورە ﴿ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّــهِ ﴾. جا ئەگەر نەفست حەزی لە تۆڵەسەندن بوو ، ئەوا بیر لە چاکـەکانی رابـوردووی بکـەرەوە و بیانژمێرە ، پاشان بەم تاوانەی چاکەیەکی بکوژێنـەوە ، بـەڵام چاکـەکانی تـری پشـتگـوێ نەخەیت ، ئەگینا ئەوە ستەمە .

ئەی یوونس ! ئەگەر دۆستێکت هـەبوو بـە هـەردوو دەسـتت بیـگـرە و بـەری نـەدەیت ، چونکە دەستخستنی دۆست گرانە و ، وازلێهێنانیشی ئاسانە .[٣٦٨]

هـەروەها فەرموویـە : هـاوەڵێتیی کەسـێک کـە شـوورەیی نـەفامێت ، شـوورەیی رۆژی قیامەتە .[٣٦٩]

هەروەها فەرموویە : ستەمکارترین ستەمکار بۆ خۆی کەسێکە کە بچووکیـی بـۆ کەسـێ بنوێنێ کە رێزی لێ نەگرێت و ، حەزی لە دۆستایەتیی کەسێکیش بێ کە بە کەڵکی نەیەت و ، ستایشی کەسێکیش ببیستێ کە نەیناسێت .[٣٧٠]

هەروەها فەرموویە : کەسێک ئارد لە ماڵیدا نەبێ راوێژی پێ مەکە .[٣٧١]

هەروەها فەرموویە : هەرکەسێ قسەی بۆ هێنای قسەیشـت دەبـات و ، هەرکەسێکیش باسی خەڵکی بۆ هێنای باسی تۆش دەبـات و ، هەرکەسیش کـاتێ کـە رازییـت کـرد وەهـا ستایشی کردیت کە پێتەوە نەبوو ، کاتێکیش کە تـووڕەت کـرد شـتانێکت پێـوە دەنـێ کـە پێتەوە نەبن .[٣٧٢]

لە باسی پیاوەتیی و مەردایەتییشدا لە ئەحنەف پرسیار کرا : پیاوەتیی چییە ؟ وتـی : داوێن پاکیی و پیشەگەریی .

---

[٣٦٨] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٣ ) .

[٣٦٩] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .

[٣٧٠] توالي التاسيس ( ٧٢ ) .

[٣٧١] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .

[٣٧٢] توالي التأسيس ( ٧٢ ) .

هەروەها پرسیاری مەردایەتیی لە یەکێکی تـر کـرا و ، وتـی : مەردایـەتیی ئەوەیـە لـە نهێنییدا کارێکێ ئەنجام نەدەی کە بە ئاشکرا لە رووت نەیەت ئەنجامی بدەی .[٢٧٣]

شافیعییش فەرموویە : مەردایەتیی چوار پایەی هەیە : رەوشتی جوان و سەخاوەت و، خۆ بەکەم زانین و ، شوکرانەبژێریی .

## ( ١٦ ) نزاو پاڕانەوەی شافیعیی :

هەرکاتێ ئیمام شافیعیی ناڕەحەتیيەکی بهاتایەتە رێ ، بە نزا و پاڕانەوە هانای دەبـردە بەر دەرگانەی خوای گەورە . بـەلاّم چونکـە بـە دڵێکـی پـڕ لـە ئیمـان و تـەقوا و یەقینـەوە دەپاڕایـەوە و متمانـەی بـە خـوای گـەورە زۆر بـوو ، ئـەوا خـوای گـەورە پاڕانەوەکـەی لێ وەردەگرت و ، لەو ناڕەحەتیيە رزگاری دەکرد ..

لە هەموو هەڵوێستێک ناڕەحەت تر بە لایەوە ئەو کاتە بوو کە بـە تـاوانبـاریی بردیانـە بـەر دەسـت ئـەمیری ئیمـانداران هارونەرڕەشـید کـە گوایـا لـە دەوڵـەتی ئیسـلام هـەڵ گەڕاوەتەوە و ناپاکیی کردووە . لەم هەڵوێستە سەختەدا هانای بردە بـەر دەرگانـەی خـوا .. خوای گەورەش گەیشتە فریای و دەربازی کرد .

فـەضلی کـوڕی رەبیـع کـە لەبـەر دەسـتی خەلیفـەدا بـوو هـەر کـاتێک ئـەو باسـەی بگێڕایەتەوە ئەیوت : چوومە ژوورەوە لای هاروونورڕەشید دەبینـم کۆمـەڵێک شمشـێر و جۆرەها شتی سزادان وان لەبەر دەستیدا .. پێمـی وت : ئـەی فـەضل ! وتم : بـەڵێ ، ئـەی ئەمیری ئیمانداران ! وتی : ئەو حیجازییەم بۆ بهێنە . واتە شافیعیی . وتم : « **إنا لله وإنـا اليه راجعـــون** » کـابرا تیـا چـوو . ئـەڵێت : هاتمـە لای شـافیعیی و پێـم وت : ئـەمیری ئیمانداران داوات دەکات .

فەرمووی : با دوو رەکعەت نوێژ بەجێبهێنم .

وتم : نوێژ بکە . نوێژی کرد و ، پاشان سواری ئێسترێکی خۆی بوو و پێکەوە چووین بـۆ کۆشکی رەشید . کـە گەیشـتینە دالانـی یەکـەم ، شـافیعیی هـەردوو لێـوی جووڵانـد . کـە گەیشـتینە حزووری رەشـید ، ئـەمیری ئیمـانداران وەک کـەسێک بچووکیـی بـۆ بنوێنـێ لەبەری هەستایەوە و ، لە جێگەکەی خۆیدا دای‌نیشاند و ، خۆیشی لەبـەردەمیدا دانیشـت

[٢٧٣] تاج العروس مادة ( مرؤ ) .

و عوزری بۆ دەهێنایەوە .. دەست و پێوەندی ئەمیری ئیماندارانیش بە پێوە سـەرنجی ئـەو هەموو جۆرە ئامێرەی سزادانیان دەکـرد ، کـەچیی وا ئێسـتا لەبـەر دەستیدا دانیشـتووە . ماوەیەکی درێژ قسە و باسیان کرد و ، پاشان ماوەی دا هەستێ و بڕوات .

پێمی وت : ئەی فەضل .

وتم : بەڵێ ، ئەی ئەمیری ئیمانداران !

وتی : توورەکەیەک پارەی بۆ هەڵ بگرە . منیش بـۆم هـەڵ گـرت و ، کـاتێ گەیشـتینە دالانی یەکەمی چوونە دەرەوە ، وتم : لەبــەر خـاتری ئـەو خوایـەی کـە توورەیـی خەلیفـەی گۆڕیی بە رەزامــەندیی لێـت پرسـیارت لێ دەکـەم و وەڵامـم بدەرەوە ، لـە رووی ئـەمیری ئیمانداراندا چیت وت وا لێت رازیی بوو ؟

پێمی فەرموو : ئەی فەضل ! وتم : لەبەیکە ، ئەی سەرداری شارەزای دین !

فەرمووی : لێم وەربگرە و لەبەری بکە :

وتم : « ﴿ شهد الله أنه لا إله إلا هو ﴾ ( آل عمران : ١٨ ) . أللهم إني أعوذ بنور قدسـك ، و ببركة طهارتك ، وبعظمة جلالك ، من كل عاهة وآفة وطارق الجن والإنس إلا طارقاً يطرقني بخير ، يا أرحم الراحمين . اللهم بك ملاذي ، فبك ألوذ ، وبك غيـــاثي فبــك أغوث ، يا من ذلَّت له رقاب الفراعنة ، وخضعت له الجبابرة . اللهم ذكرك شــعاري ، ودثاري ، و نومي ، وقراري ، أشهد أن لا إله إلا أنت ، إضـــرب علـــي ســـرادقات حفظك ، وقني رعبي بخير منك يارحمن » .

فـەضل ئـەڵێت : منیش نووسیمەوە و بـە گومەزییـەکدا هـەڵم واسیی . ئـەوە بـــوو رەشـیدیش زۆرم لێ تـوورە دەبـوو ، جـا هـەرچیی بیویستایە لێم تـوورە ببـــێ لـــە رووی دا دەمجووڵاند ، ئیتر رازیی دەبوو . منیش لە بەرەکەتی شافیعیی ئەوەم دەست کەوت .[٣٧٤]

یەکێ لەو دوعایانەی کە ناوبانگی بووە شافیعیی فەرموویێتی ئەمەیە : « يا لطيـــف ! اسألك اللطف فيما جرت به المقادير » .

ئیبن خەلەکان وتوویە : لە نێوان زانایاندا وا مەشهوورە کـە دوعایـەکی گـیرا بـووە و ، تاقیيش کراوەتەوە .[٣٧٥]

---

[٣٧٤] الطبقات الكبرى ( ٢: ١٥٢ ) .

[٣٧٥] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣٠٦ ) .

ئیمام شافیعیی له هەموو هەڵوێستێکدا پەنای دەبردە بەر دەرگانەی پەروەردگار و لێی دەپاڕایەوە . ئەوە بوو رۆژێکیان لە کاتی حەجدا بۆ وت و وێژ کۆڕی بەست و ، لەو کاتەدا ئافرەتێک هات و پارچە کاغەزێکی بۆ هەڵ دا کە تیایا نووسرابوو :

عفـا الله عن عبدٍ أعـانَ بدعوَةٍ خليلَين كـانـا دائمين على ودّ

إلى أن مشى واشي الهوى بنميمةٍ إلى ذلك من هذا فزالا عن العهد [٣٧٦]

ئیمام شافیعیی ، کە بە هۆی ئیمانەوە دڵی یەکجار ناسک بووە ، دەست بە گریان دەکات و ئەفەرموێ : ئەمڕۆ رۆژی وت و وێژ نیە ، ئەمڕۆ رۆژی دوعایە . دەستی بە پاڕانەوە کرد و هەر خەریکی وتنی اللهم اللهم بوو هەتا هاوەڵانی هەستان و رۆیشتن . [٣٧٧]

یەکێ لەو دوعایانەی کە لە ئیمامەوە دەیگێڕنەوە دوعایەکە کە بۆ مردوویەکی کردووە. یوونسی کوڕی عەبدولئەعلا ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ : گوێم لە شافیعیی بوو ، کە هاتبووە سەر مردوویەک ، دوای ئەوەی دامان پۆشیی ، سەیری کرد و فەرمووی : « اللـهم بغناك عنه، وفقره إليك اغفرلـه ». [٣٧٨] لە خوا دەپاڕێتەوە کە لەبەر دەوڵەمەندیی و بێباکیی خۆی و هەژاریی و ئاتاجیی ئەو مردووە لێی خۆش ببێ ..

## ( ١٧ ) فەرمایشتی شافیعیی :

شافیعیی نموونەی پیاوی تەواو و ، پیاوی رێک و پێک بوو .. بۆیە مەردانە شوێن راستیی دەکەوت و ، پیاوانەش خۆی پەروەردە کردبوو و ، جڵەوی نەفسی ئەممارەی توند گرتبوو ، تا خزمەتی دین و زانست و حەق هەڵ بژێرێ و ، واز لە سۆز و ویستی کەسیی خۆی بهێنێ . بۆیە بە رۆحێکی یەکجار پاکەوە خەریکی خزمەت دەبوو .. ئەوەندە بە پاکیی کاری دەکرد خوای گەورە بە هەموو شێوەیەک پشتگیریی لێ دەکرد ، هەتا چەند وتەی جوان بە دەمیا هاتوون کەکەس لەوەو پێش نەی وتوون .

---

[٣٧٦] بەم دوو دێڕە دەری خست کە ناحەزێک کەوتۆتە نێوان خۆی و مێردەکەی و تێکی داون و ، بەڵکو ئیمام دوعای خێریان بۆ بکات .

[٣٧٧] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣٠٦ ) .

[٣٧٨] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٢ ) .

ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا بۆمان بـاس دەکـات کـە شـافیعیی سـێ وتـەی جوانـی هەیە کە لە ئیسلامدا لە پێش ئەوەوە کـەس نـەیوتوون و دوای ئـەویش بـە دەمـی کـەسدا نەهاتوون :

**یەکەمیان :** لە ئیبن خوزەیمەم بیستووە کـە ئـەیوت : لـە موزەنییـم بیسـتووە کـە ئەیوت : لە شافیعییم بیستووە کە ئەیفەرموو : « إذا صح لكم الحديث ، فخذوا بـــه ، ودعوا قولي » داوا لە فەقیهـ و موجتەهیدان دەکـات بـە کوێرانـە شـوێن ئـەم نەکـەون ، بەڵکو سەرنج بدەن ئەگەر فەرموودەی صەحیحیان دەست کەوت با واز لە راکەی ئەم بهێنن .

**دووهەمیان :** لە ئیـبن مونلیـرم بیسـت ئـەیوت : لـە حەسـەنی کـوڕی موحەممـەدی زەعفەرانییم بیستووە کە ئەیوت : لە شافیعییم بیستووە کە ئەیفەرموو : « ما نـــاظرت أحداً ، فأحببتُ أن يخطيء » . واتە : لەگەڵ هیچ کەسدا بەرابەرکێم نەکردووە و پێم خۆش بێ هەڵە بکات .. ئەمە دەری ئەخات کە شـافیعیی هـەڵگری چ دڵێکـی پـاک بـووە ؟ ئـەم حەقی ویستووە دەربکـەوێ ، خـوا بکـا حـەق بـەلای بەرامبـەرەوە بێـت .. ئەمـە فرێدانـی ئەنانییەتە لە بەرزترین پلەدا !! کەسێک ئەم رایەی هەبێت دیارە خۆی بـە خزمـەتگوزاری ئیسلام و موسڵمانان دەزانێت و هیچی تر .

**سێهەمیان :** لە مووسای کوڕی موحەممـەدی دەیلـەمییم بیسـتووە کـە ئـەیوت : لـە رەبیعیی کوڕی سولەیمانم بیستووە کە دەیوت : لە شافیعییم بیستووە کـە ئـەیفەرموو : « وددتُ أن الناس تعلموا هذه الكتـــب ، ولم ينســـبوها إليّ » [٣٧٩] هـەموو ئـاواتێکی ئەوەیە خەڵکیی شارەزای شەریعەت ببێ و ، هەرچیی زانستی هەیە موسڵمانان فێری بـبن ، ئیتر قەیدی نیـە ئـەو کتێبانـەی بـە نـاوی ئـەوەوە بـڵاو نەبنـەوە گرنـگ ئەوەیـە خـەڵک کەڵکیان لێ وەربگرێ .

شایانی باسە ئیمام شافیعیی دووجار داوای لێ کراوە تا کاروباری ( قضـــــاء ) بگرێتـە دەست ، کەچیی بە دەستی نەگرتووە

**یەکەمیان :** لە سەردەمی خەلیفە هاروونوڕڕەشیددا بووە ، کاتێک کـە لەگـەڵ هەندێ عەلەوییدا بە تاوانباریی هێنایانە بەغدا و ، دوایی خەلیفـە دڵـی چـووە سـەر رەوشـت و زانستی و ، بووە جێی متمانەی ، بە رادەیەک داوای لێ کرد کاروباری ( قضاء ) وەربگرێ ، کەچیی ئیمام نەیویست . خەلیفە وتی : چیت پێویستە داوای بکە . فەرمووی : پێویستیی

---

[٣٧٩] آداب الشافعي ومناقبه ( ٣٢٥ ) .

من ئەمەیە کە بەشی شەرعیی ( ذوي القربى ) لە میصر بەشم بدرێت و بمنێریتــە ئـەوێ . ئەوە بوو خەلیفە بە گوێی کرد و نامەشی بۆ ئەمیری میصر نووسیی .[٣٨٠]

**دووهەمیان** : لـە سەردەمی خەلیفـە مـەئموونـدا بـووە ، کـاتێـك کـە شـافیعیی لــە میصردا بووە . ئەوە بوو خەلیفـە نێرراوی خـۆی دەنێرێتـە میصـر لای و داوای لێ دەکـات کاروباری (قضاء) بە دەست بگرێ .

بەڵام لەوکاتەدا ئیمام یەکجار نەخۆش بوو . ئەوە بـوو لـە خـوای گـەورە پاڕایـەوە کـە ئەگەر ئەوکارە بۆ دین و دنیا و قیامەتی چاکە ئەوا ســەربگرێت ، ئـەگینا بیباتـەوە بـۆلای خۆی کە فەرمووی : « **اللهم إن كان خيراً لي في ديني و دنياي وعاقبة أمــري فأمضــه ، وإلا فاقبضني إليــك** » . ئـەڵێ : بـە سێ ڕۆژ دوای ئـەم دوعایـە کۆچـی دوایـی کـرد و ، نێرراوەکەی خەلیفەش هێشتا نەگەڕابوویەوە .[٣٨١]

---

[٣٨٠] توالي التأسيس ( ٧٧ ) .

[٣٨١] توالي التأسيس ( ٨٤ ) .

# نەخۆشکەوتن و کۆچی دوایی

لە ماوەی تەمەنێکی کورتدا ئیمام شافیعیی خزمەتێکی زۆری ئیسلام و موسڵمانانی کرد .. بەڵام خزمەتێکی ناوازە .. هەروەک ئەو خزمەتە چاوەڕوانی پیاوی خۆی بێ ، بێت و بە موسڵمانان بە تایبەتیی و بە مرۆڤایەتیی بە گشتیی پێشکەشی بکات .. ئیتر ئەوە بوو کە کاری سەرشانی ـ کە بۆی نەخشە کێشرابوو ـ تەواو کرد ، تووشی نەخۆشیی بوو . لە میصر تووشی نەخۆشیی مایەسیریی بوو ، ئەمەش لە ئەنجامی بەکارهێنانی ( لُبّان )کە رووەکێکی دڕکاوی‌یە و بۆ لەبەرکردن و زیرەکیی کاریگەرە ، وەک خۆی ئەفەرموێ : بۆ لەبەرکردن ( لُبّان ) م بەکار هێنا ، لە ئەنجامدا بۆ ماوەی ساڵێک خوێنم دانا .[382] ئەم خوێن لێ ڕۆیشتنە هەر بەردەوام بوو ، بە [illegible] کە ئەگەر سواری ولاغ ببوایە لە پاژنەکانیەوە خوێن سەری دەکرد ، هەتا زۆر جار [illegible] کە لبادی تیابوایە لە ژێری خۆیدا دای دەنا .. نەخۆشی‌یەکی یەکجار سەخت بوو .. ئەوەبوو ئەو خوێن‌لێ‌ڕۆیشتنە هێزی لێ بڕیی .

یوونسی کوڕی عەبدولئەعلا ئەڵێت : کەسم نەدیوە وەک شافیعیی دەردی گران بێت .[383]

جا بەم نەخۆشی‌یە سەختەوە ئیمام شافیعیی توانیی ئەو هەمووە نووسینەی ئیجتیهادە نوێکەی لە ماوەی چوار ساڵدا بنووسێت ، کە بە هەزارەها پەڕە دەبوو ، سەرەرای دەرس وتنەوە و بەرابەرکێ و خوێندنەوەی بەردەوامی شەو و رۆژی .

هەرچۆن بوو نەخۆشیی یەکی شافیعیی خست و دای هێنا و چاوەڕوانی هاتنی ئەجەلی دەکرد .. ئەوە بوو لە دواساتەکانی تەمەنی‌دا یەکێ لە قوتابی‌یە ناودارەکانی ، کە موزەنیی بوو ، هاتە لای و هەواڵی نەخۆشی‌یەکەی پرسیی ، ئیمامیش وەلامی دایەوە و فەرمووی : « أصبحت من الدنيا راحلاً ، وللإخوان مفارقاً ، ولكأس المنية شارباً ، وعلى الله جل ذكره وارداً ، ولا والله ما أدري روحي تصير إلى الجنة فاهنئها ، أو إلى النار فأعزيها » .

[382] شذرات الذهب ( ٢ : ٩ ) .

[383] تهذيب الأسماء واللغات ( ١ : ٦٥ ) .

دەری برِیی کە ئەم دنیایە بەجیّدەهیّلیّ و ، لە برایان دادەبرِیّت و ، شەرابی مەرگ دەچیّژیّت و ، بە خوای گەورە دەگاتەوە .. ئیتر نازانیّ رِۆحی بە بەهەشت دەگات تا پیرۆزبایی لیّ بکات ، یان بۆ ناو ئاگر دەرِوات تا سەرەخۆشیی لیّ بکات .. پاشان دەست بەگریان دەکات و پارچە شیعریّك ئەلّیّت کە بریتی‌یە لە وت‌وویّژیّکی پرِ ئەدەب لەگەلّ پەروەردگاردا و ، لاوازیی و تاوانباریی خۆی دەردەخات و چاوەرِوانی چاوپۆشیی خوایە کە ئەفەرمویّ :

ولـما قسى قلبي وضـاقت مذاهبي جعلت الرجا مني لعفوك سُلَّما
تعـاظمني ذنـبي فلمـا قـرنتـه بعفوك ربي كان عفوك أعظما
ومازلت ذا عفو عن الذنب لم تزل تـجود وتعفو منةً وتكرمـا [٣٨٤]

هەر لەوکاتەدا یوونسی کورِی عەبدولئەعلا دەچیّتە ژوورەوە لای و ئیمام پیّی ئەفەرمویّ : ئەبو مووسا ! ئایەتی صەد و بیستی ئالی عیمران بە دواوەم بەسەردا بخویّنە، بەلاّم خویّندنەکەت دەرمەخە و با قورسیش نەبیّ . منیش بەسەریدا خویّندم .. کە ویستم هەستم ، فەرمووی : لیّم غافلّ نەبی ، چونکە من وام لە تەنگانەدا .

یوونس ئەلّیّ : مەبەستی شافیعیی لە ئایەتی صەد و بیست بە دواوە ، باسی ئەو نارِەحەتی‌یەیە کە هاتە بەردەم پیّغەمبەر ﷺ و هاوەلّەکانی .[٣٨٥]

حەرمەلەش ئەلّیّ : شافیعیی پیّمی فەرموو : برِۆ بۆ لای ئیدریسی خواناس و پیّی بلّیّ : لای خوای گەورە بۆم بپارِیّتەوە .[٣٨٦]

رەبیع یش ئەلّیّت : کە خۆر ئاوا بوو ، ئامۆزاکەی پیّی وت : دادەبەزینە خوارەوە بۆ نویّژ کردن . فەرمووی : دانیشن چاوەرِوانی دواهەناسەم بن .. ئیّمەش خیّرا دابەزین و پاشان هاتینەوە سەرەوە ، وتمان : نویّژت کرد ؟ فەرمووی : بەلّیّ . ئەوە بوو داوای ئاوی کرد و ، کاتیش زستان بوو . ئامۆزاکەی وتی : ئاوی گەرمی تیّکەلّ بکەن . شافیعیی فەرمووی : نا ، ربی بەهیّی تیّکەلّ بکەن . ئەوە بوو دوای نویّژی عیشا کۆچی دوایی کرد .[٣٨٧]

[٣٨٤] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٦ ) .
[٣٨٥] آداب الشافعي ( ٧٦ ) .
[٣٨٦] توالي التأسيس ( ٨٣ ) .
[٣٨٧] توالي التأسيس ( ٨٤ ) .

رەبیعی کوڕی سـولەیمان ئـەڵێت : شـافیعیی شـەوی جومعـە دوای عیشـا کـە دواڕۆژی رەجەب بوو کۆچی دوایی کرد و ، رۆژی جومعەش ناشتمان . کە گەڕاینەوە هیلالی مـانگی شەعبانی ساڵی دووصەد و چوارمان بینیی ، کە تەمەنی پەنجا و چوار ساڵ بوو .[٣٨٨]

تەرمەکەیان لە فوسطاطی میصرەوە بەرەو قەبرسـتانی نـەوەی زوهـرە هـەڵ گـرت ، کـە کۆمەڵێک لە نەوەی زوهرە لە نەوەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفی زوهەریی لـە دەوریـا نێژرابوون .. ئەو قەبرستانە ( تربة ابن عبدالحكم ) یشـی پـێ دەوتـرێ ..[٣٨٩] قـەبری ئیمـام شافیعیی لەوێ بەناوبانگە و کە سێ قەبر لە پاڵ یەک دان ، کە ئەو دوانەکـەش یـەکێکیان قـەبری عـەبدوڵلای کـوڕی عەبدولحەکەمـە کـە سـاڵی ( ٢١٤ ) ی کۆچیـی کۆچـی دوایـی کردووە و ، ئەوی تریشیان قەبری عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵلای کـوڕی عـەبدولحەکەمـە کە لە ساڵی (٢٥٧ ) ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە .[٣٩٠]

کە دەنگ و باسی کۆچـی دوایـی ئیمـام شـافیعیی بـڵاو بوویـەوە ، خـەڵکیی سەرسـام و وڕبوون و، زانایان خەم و خەفەت دای‌گرتنەوە و ، ئەڵقە دەرسەکانی چـۆڵ بـوو .. هـەتا دوای مردنی بە ماوەیەکی کەم عەرەبێکی دەشتەکیی دێتە مزگـەوت و لەسـەر ئەڵقەکـەی ئیمـام دەوەستێ و ئەڵێ : ئەوە خۆر و مانگەکەی ئەم ئەڵقەیە کوا ؟ وتیان : کۆچـی دوایـی کـرد . کە ئەمە ئەبیستێ دەست بەگریانێکی گەرم دەکات و ئەڵێت :

« رحمه الله و غفر له ، فقد كان يفتح ببيانه مغلق الحجة ، ويسد على خصمه واضـح المحجة ، ويغسل من العار وجوهاً مسودة ، ويوسع بالرأي أبواباً منســـدة » .[٣٩١] پاشـان رۆیشت .[٣٩٢]

لەو کاتەدا کـە ئیمـام کۆچـی دوایـی کـرد خـەڵکێکی زۆر لـە خواناسان و پیاوچاکـان و زانایان خەویان دەبینی ، کـە ئەمـەش بەڵگـە بـوو لەسـەر گـەورەیی ئـەو موسیبەتەی کـە تووشی ئیسلام و موسڵمانان بوو ، ئەویش بە لە دەستدانی ئەو کەڵەزانایـەی کـە مەردانـە خزمەتی شەریعەتی پێغەمبەری ئـازیزی ﷺ کـرد و ، خـەڵکیی بـە وردیـی تـێ گـەیاند و ، بەرگرییەکی بێ‌وێنەی لە سوننەت کرد و سەری ئیسلام و موسڵمانانی بەرز کردەوە .

---

[٣٨٨] صفة الصفوة ( ٢ : ١٤٧ ) و آداب الشافعي ( ٢٦ ) .

[٣٨٩] تاج العروس : شفع .

[٣٩٠] معجم الأدباء ( ١٧ : ٣٢١ ) .

[٣٩١] پێمان خۆش بوو دەقی وتەکانی دابنێین نەک وەرگێرانەکەی .

[٣٩٢] الوافي بالوفيات ( ١ : ١٧٧ ) .

عەزیزیی ـ کە پیاوێکی خواناس بووە ـ ئەڵێت : ئەو شەوەی کە شـافیعیی تیایـا کۆچـی دوایی کرد لە خەومدا دەوترا : ئەمشـەو پێغەمبـەر ﷺ کۆچـی دوایـی کـردووە و ، وەهاشم بەرچاو دەکەوت کە لە مەجلیسی عەبدوررەحمانی زوهەرییدا لە مزگەوتدا دەشـۆرێت و ، پێیشم وتـرا : دوای عـەصر بـۆ سـەرقەبرانی دەبـەن . کـە رۆژم لێبوویـەوە پێیـان وتم : شافیعیی مردووە و ، پێشیان وتم : دوای جومعە بۆ سەر قەبرانی دەبەن . وتم : ئەوەی مـن لە خەومدا دیومە ، پێیان وتم : دوای عـەصر بۆ سەرقەبرانی دەبەن و لە خەویشمدا ـ کاتێ کە بردیان بۆسەر قەبران ـ وام دەزانی جەنازەیەکی شـڕی ئـافرەتێکی لەگـەڵدایـە . ئـەوەبوو ئەمیری میصر پیاوی ناردبوو کە : تا دوای عەصر نەیبەن بـۆ سـەرقەبران . ئـەوە بـوو تـا دوای عەصر هێشـتیانەوە .. عـەزیزیی ئـەڵێت : ئامـادەی بـەڕێکردنی جەنازەکـەی بـووم ، کاتێک گەیشتمە شـوێنە فراوانەکـە دەبینـم وا جەنازەیـەک ـ بـە وێنـەی جـەنازە شـڕەکەی ئافرەتەکە ـ لەگەڵ جەنازەکەیدایە .[٢٩٣]

سوفیانی کوڕی وەکیعی کوڕی جەڕڕاحیش ـ کە تیرمیذیی و ئیبنماجـە فـەرموودەیان لێ وەرگرتووە و ساڵی ( ٢٤٧ ) ی کۆچیی کۆچـی دوایـی کـردووە ـ ئـەڵێت : لـە خـەومدا وام دەزانیـی کـە قیامـەت هەسـتاوە و خـەڵکیی بـە جـارێ پەشـۆکاون ، لەوکاتـەدا براکـەم بـۆ دەرکەوت و وتم : ئێوە چۆنـن ؟ وتـی : براینـە بـەردەم پـەروەردگارمان . وتم : ئـەی بـاوکم چۆنـە؟ وتـی : چاوپۆشـیی لێ کـرا و ، فـەرمان درا بـبرێت بـۆ بەهەشـت . وتم : ئـەی موحەممەدی کوڕی ئیدریس ؟ وتی : بە وێنەی نوێنەر برا بۆ لای خوای رەحمان و ، خشڵی کەرامەی لەبەر کراو ، تاجی بەهایش کرایە سەری .[٢٩٤]

رەبیـع یـش ئـەڵێت : لەخـەوم دا ئـادەم ( علیـه السـلام ) کۆچـی دوایـی کردبـوو . کـە پرسـیاری تەعبیرەکـەیم کـرد ، وتیـان : ئـەوە نیشـانەی مـەرگی زانـاترینی دانیشـتوانی سەرزەوییە ، چونکە خوای گەورە زانستی هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد . ئەوەندەی پێ نەچوو ، شافیعیی کۆچی دوایی کرد .[٢٩٥]

---

[٢٩٣] آداب الشافعي ( ٧٣ ).

[٢٩٤] الوافي بالوفيات ( ٢ : ١٧٦ ) .

[٢٩٥] المجموع ( ١ : ١٥ ) .

هەروەها ئەڵێت : شافیعیی دوای مردنی لە خـەوم‌دا بینـی ، وتم : ئەبوعـەبدوڵڵا ! خـوا چیی پێ‌کـردی ؟ فـەرمووی : لەسـەر کورسـی‌یەکی زێڕیـن دای‌نیشـاندم و ، لوئلوئـی تـەڕی بەسەرم‌دا پژاند .[۳۹٦]

ئێستەش با ئازیزانمـان گـوێ لـەم چیرۆکـە خنجیلانەیـە بگـرن دەربـارەی گواستنەوەی تەرمەکەی ئیمام شافیعیی بۆ بەغداد

ئەم چیرۆکە بەڕێز مەقریزیی[۳۹۷] لە کتێبی ( الخطط ) دا بەم شێوەیە گێڕاویەتەوە :

( نظام الملك ) ئەبوعـەلیی حەسەنی کوڕی عەلیی کـوڕی ئیسـحاق کـە مـاوەی دە سـاڵ وەزیـری سـوڵتان ئـەلب ئەرسەلان بـووە و ، خزمـەتی کردووە و ، لـە سـەردەمی سـوڵتان مەلیکشای کوڕیشی‌دا بۆ ماوەی بیست ساڵی تر کاروبار هەر هەمووی لە دەستی‌دا بووە ، بە رادەیەک کە وڵات گەشەی کرد و زانایان بە دڵی خۆیـان کاریـان دەکـرد ، کـە لـە سـاڵی چوار صەد و حەفتا و چواری کۆچیی‌دا لە بەغداد قوتابخانەی ( النظامیـة ) ی بنیـات نـا ـ پێـی خۆش بـوو تەرمەکـەی ئیمـام شـافیعیی لـە قەبرسـتانی میصـرەوە بگوازێتـەوە بـۆ قوتابخانەکەی خۆی .

بۆ ئەمە نامەی بۆ ( بدر الجمالي )[۳۹۸] ئەمیری سوپا و وەزیری دەوڵەتی ( المستنصر بالله ) مەعدی کوڕی عەلیی کوڕی ( الحاكم بـأمر الله ) کـە یـەکێ بـوو لـە خەلیفـەکانی دەوڵەتی فاطیمیی لە میصر ، نووسیی و دیاریی و خـەڵاتێکی زۆر زۆری بـۆ نـارد و داوای لێ‌کرد لاشەی پیرۆزی ئیمام شافیعیی بۆ رەوانە بکاتەوە .

ئەمیری سوپا بە خۆی دەستە و تاقمەیەوە ، بەوپەڕی سام و هەیبەتەوە ، لەگـەڵ پیـاوە ناودارەکانی دەوڵەت‌دا و ، لەگەڵ زانا ناودارەکانی میصردا کەوتە ڕێ و خەڵکیش پـۆل پـۆل وەستابوون و تەماشای ئـەو قەڵەبالغیـیەیان ئـەکرد .. کـە چوونـە سـەر قـەبران و ویستیان قەبرەکە هەڵ بکەنن ، خەڵکەکە زۆر ناڕەحەت بـوون .. قرەقڕ و هـەرا هـەرا بەرزبوویـەوە وەها دڵی ئەو خەڵکە گەرم بوو خەریک بوو رەجمی ئەمیر بکەن و لێـی هـەڵ بگەڕێنـەوە کە ئەمیر ئەمەی زانیی ، خەڵکەکەی بێ‌دەنگ کرد و ، هەواڵیشی بۆ ئەمیری ئیمان‌داران

---

[۳۹٦] ...فة الصفوة ( ۲ : ۱٤۷ ).

[۳۹۷] ...قریزیی : ئەحمەدی کوڕی عەلیی کوڕی عەبدولقادرە کە مێژوونووسی بەناوبانگی وڵاتی میصر بووە و ، بە ...سەن خەڵکی ... ... . لە قاهیرە لە ...ایک بووە و هەر لەوێش لە ساڵی ( ۸٤٥ ) ی کۆچیی‌دا کۆچی دوایی کردووە .

[۳۹۸] ئەمیری سوپای میصر و باوکی مەلیک ( افضـل ) شاهنشاه بووە ، ساڵی ٤۸۷ ی کۆچیی کۆچی

خەلیفە ( المستنصر ) نارد کە کارەکە ئەنجام نادرێ . خەلیفە وەڵامی گێرایـەوە کـە دەبـێ ویستی ( نظام الملـــك ) جێبـەجێ بکـرێ .کـە وەڵامـەکـە گەیشـت لـەلای قەبرەکـەدا بـۆ خـەڵکیی خوێنرایـەوە و هـەرچیی دەنـگ و هـاواری لێ بـەرز دەبوویــەوە دوورخرانــەوە و دەستیان بە هەڵ کەندن کرد هەتا گەیشتنە لای قەبرەکە . کە ویستیان خشتی سەر قەبرەکە لابدەن ، لە قەبرەکەوە بۆنی جۆرە عەترێکی بەرزبوویــەوە کـە هـەرچیی بەسـەر قەبرەکـەوە بـوون هـەر هـەموویانی بێهـۆش کـرد و کـەوتن و ، دوای سـەعاتێک ئەوسـا هۆشـیان بـە خۆیاندا هاتەوە و ، لە خوا پاڕانەوە تا لەسەر ئەم کارەیـان لێیـان ببـوورێ و ، قەبرەکـەیان وەک خۆی لێکردەوە و ، گەڕانەوە دوا .. بە راستیی رۆژێکـی نـاودار بـوو .. ئـەوە بـوو بۆ ماوەی چل شەو و رۆژ خەڵکیی بە کۆمەڵ دەهاتنە سەردانی قەبرەکەی ئیمام شافیعیی و ، ئەوەندەش قەڵەبالغ بوو بە ناڕەحەتی‌یەکی زۆر دەگەیشتنە لای قەبرەکە .

ئـەمیری سـوپا کـە ئـەم حاڵـەی دیـی رووداوەکـەی وەک خـۆی نووسـی‌یەوە و ، لەگـــەڵ دیاری‌یەکی زۆر و نامەیەکدا ناردی بۆ ( نظام الملك ) و، ئەویش لـەوێ خـەڵکێکی زۆری لە هەموو چین و توێژەکان کۆکردەوە و نامەکەی بۆ خوێندنەوە . بە راستیی ئەو رۆژەش لە بەغداد رۆژێکی دیار و ناودار بوو ..

( نظام الملك ) هەر بەمەشـەوە نەوەسـتا بـەڵکو نامەیـەکی بۆهـەموو ناوچـە جـۆر بـە جۆرەکـانی دەوڵـەتی فراوانـی ئیسـلام نووسیی و نامـە و نووسـینەکەی ئـــەمیری ســوپای میصریشی لەگەڵدا ناردن و لە هەموو ئەو ناوچانەدا موسـڵمانان کۆدەکرانـەوە و نامەکـە و رووداوەکەیان بۆ دەخوێنرایەوە . بەمە ئیمام شافیعیی ئـەوەندەی تـر رێـز و حورمـەتی لـە دڵی موسڵماناندا زیادی کرد .

پاشان مەقریزیی مێژوونووس روونی دەکاتەوە کە لەو کاتەوە قەبری شافیعیی سەردانی دەکرێت هەتا ئەوەبوو رۆژی یەک شەممەی حەوتەم رۆژی مانگی جومادی یەکـەمی سـاڵی ( ٦٠٨ ) ی کۆچیـی هاتـە بـەرەوە .. ئـەو رۆژەی کـــە ئـــەو گومەزیـــەی کـــەوا بەســـەر قەبرەکەیەوە تەواو کرا ، ئەمەش بـە دەستی پادشـای پایـەدار ئـەمیری ئیمـانداران نـاصر الدین ظهیری کوڕی سوڵتانی پادشای دادپەروەر سیف الدین ئەبوبـەکری کـوڕی ئـەییووب ، کە پەنجا هەزار دیناری میصریی ئەو رۆژەی تێ چوو ..

جا لە بارەی ئـەو گومەزیـەوە چـەند شـاعیرێک شیعریان وتـووە ، کـە یـەکێ لەوانـە ئەدیبی نووسەر ( ضياء الدين ابو الفتح ) مووسای کوڕی مولهەم بووە ، ئەڵێت :

مــررت على قبة الشــافــعي
فعاين طرفي عليها العشاري
فــقلت لــصحبي : لا تعجبوا
فإن المراكب فوق البحــار

هەروەها ( علا الدين أبو علي ) عوثمانى كوڕی ئیبراهیمی نابولسییش وتوویە :

لقد أصبح الشافعي الإما م فــينا لــه مــذهبُ
ولو لم يكن بحر علــم لما غدا وعلى قبره مركبُ

هەروەها ئاماژە بۆ قەبرەکەی ، شاعیرێکی تریش وتوویە :

اتيت لــقبر الشــافعي أزوره تعرضنـــا فلكٌ وما عنده بحرُ
فقلت : تعالى الله تلك إشارة تشير بأن البحر قد ضمه القبرُ

لە تاج العروس‌یش‌دا شاعیر ئاماژەی بۆ قەبری شافیعیی کردووە :

أكرم به رجلاً ما مثله رجــل مشارك لرسول الله في نسبه
اضحى بمصر دفيناً في مقطمها نعم المقطّم والمدفون في تربه

ئیمام بوصیرییش کە ناوی موحەممەدی کوڕی سەعیدی کوڕی حــەمادی صەنـهاجیی میصریـیە و خـاوەنی ( الــبردة ) یـە و لـە سـاڵی ( ٦٩٦ ) ی کۆچیـی‌دا کۆچـی دوایـی کردووە، وتوویـە :

بــقــبة قــبر الشــافــعي ســفينة
رســت من بنــاء محــكم فــوق جــلمود
وإذ غاض طوفــان العــلوم بقــبره
استوى الفلك من ذاك الضريح على الجودي



# لە کۆتاییدا

ئازیزان ! ئەمە کورتە ژیانێکی ئیمام شافیعیی بوو .. ئەمە کورتە ژیانی مەردێکە کە ئیسلام پەروەردەی کرد و پێی گەیاند .. ئەمە نموونەی هەزارەها بەڵکو ملیۆنەها مەرد و بەشەرەف و بەغیرەتە کە ئیسلام بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیی پێی گەیاندن ..

بەڵێ ، ئیمام شافیعیی وەک مۆم خۆی تواندەوە و ، بەرهەمێکی نایابی بۆ ئوممەتی ئیسلام بەجێ هێشت ، بێ ئەوەی چاوی لە ژیان و ، خۆشیی و سەروەت و سامانی ئەم دنیایە بێت.. بە پەروەردەیەکی ئیمانیی ناوازە فێری ئەوە بوو کە تەنها مەبەستی رەزامەندیی خوا بێت ..

ئیمام شافیعیی بە سەری بەرزەوە رێی قیامەتی گرتە بەر و گەڕایەوە بارەگای پەروەردگاری تا پاداشتی خۆی لای خوای خاوەن شەفەقەت و سەخاوەت وەربگرێت و ، لە بەهەشتی بەریندا پشوویەک بدات ..

سەربەرزیی بۆ ئەوانەی کە دەبنە قوتابیی شافیعیی و هاوڕێنانی تا خزمەت بە بەندەکانی خوا بکەن و ، گوڵێک زیاتر لەم ژیانەدا بڕوێنن و دڕکێکیش زیاتر لەبەر پێی رێبوارانیدا لابدەن ..

سەربەرزیی بۆ ئەو بەڕێزانە کە مەبەستیان ئاسوودەیی و سەرفرازیی ئادەمییەکانە و ، ناواتەخوازن ئادەمییەک زیاتر رێبازی خواناسیی بدۆزێتەوە ، تا لە ئاگری دۆزەخ رزگاری ببێ ..

خوای گەورە کۆمەکی هەموو خێرخوازێک بێت ، بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتیی ..

خوای گەورە هیدایەتمان بدات لە ژێر بەیداخی رسول الله دا بوەستین و ، لە شەفاعەتیشی بێبەش نەبین ..

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين .

**سلێمانیی**

**١٠ / رەبیعی دووهەم / ١٤٢٢ ك**

**١٠ / ٧ / ٢٠٠١ ز**



# سەرچاوەکان

| کتێب | دانەر |
|---|---|
| الإصابة | ابن حجر العسقلاني |
| الإمام الشافعي ، فقيه السنة الاكبر | عبدالغني الدقر |
| حلية الأولياء | أبو نُعَيم الأصبهاني |
| صفة الصفوة | ابن الجوزي |

# ناوەرۆك

باس — لاپەرە


پیشەکیی ........................................ ٣
پیگەیشتنی شافیعیی ........................... ٧
بەرەو مەدینەی مونەووەرە ..................... ١٨
گەرانەوەی بۆ مەککە .......................... ٢٨
دووهەم و سی هەم گەشتی بۆ عیراق ......... ٢٤
گەشتی ولاتی میصر ........................... ٤٦
فراوانیی زانستی شافیعیی ..................... ٥٦
١ ـ زانستەکانی قورئان ......................... ٥٧
٢ ـ زانستی فەرموودە .......................... ٥٩
٣ ـ فیقهی شافیعیی ............................. ٦٨
٤ ـ بەرابەرکی .................................... ٧٢
٥ ـ زانستی کەلام ................................ ٧٨
٦ ـ شارەزایی زمان و شیعر .................... ٨٥
٧ ـ فیراسەتی شافیعیی .......................... ٩٠
٨ ـ نووسینی شافیعیی ........................... ٩٣
٩ ـ زانایان و ستایشی ئیمام شافیعیی ......... ٩٨
١٠ ـ ستایشی هەندی لە زانایان ............... ١٠٣
١١ ـ نوی خوازی صەدەی دووهەم ............... ١٠٨
١٢ ـ عەقلی شافیعیی ............................ ١٠٩
١٣ ـ تەقوا و خوا پەرستی شافیعیی ............ ١١١
١٤ ـ سەخاوەتی شافیعیی ......................... ١١٣
١٥ ـ حیکمەتی شافیعیی .......................... ١١٦
١٦ ـ نزا و پارانەوەی شافیعیی .................. ١٢٠
١٧ ـ فەرمایشتی شافیعیی ........................ ١٢٢
نەخۆش کەوتن و کۆچی دوایی .................. ١٢٥
لە کۆتایی دا ..................................... ١٣٢
سەرچاوەکان ...................................... ١٣٣



﴿ما رأينا ولا سمعنا أكمل عقلا، ولا أحضر فهما، ولا أجمع علما من الشافعي﴾.

من أقوال الفضل بن دكين

لە بڵاوکراوەکانی
کتێبخانەی سۆز لە سلێمانیی